( بەستەم )
هەستەیــە • کەڤــــرەکە ـ
بەرددکە بـاگرە • دەمێــن
کەڤارە ـ دبي هێزي کــورد
چفارە واگرێ خوە پـــــێ
ڤێدخن • ع ـ ( •• ) •

( بەزم )
شاهي و گۆڤەند ودیلانە •
ع ـ (الافراح) •

## ( به ـ ن )

( بەن )
نافـــێ دارەکێیــــە ببـــین
وبەنیشتـــــە • بچوکـــێ وێ
(بەنکە) دەرباس بویە •

( بەن )
نەخە •زوەریس بچوکترە•
وژ(تا) مەزن ترە • یـــەك
تایێ ریس تێ گوتن ( بەن )•

( بەتلان )
یا بەتلانە • رۆژا اینویەك
شەم وشمەیـــــە (این) رۆژا
بەتلانا مسلمانایە • شەمـــــە
ژ بۆ جهوا یە یەكشەم ژبـۆ
فلهایە ••رۆژەکە بێ کاری یە•
ژبو بێن بەردانە •
ع ـ (یوم العطلة) •

( بەتان )
دخن چاکیت و متێل و کنجا •
ع ـ ( •• ) •

( بەستن )
گرێدانـــــە • دەستبەستی ـ
دەست گرێدای•کەمەربەست،
ئێ کۆ گەمەری ل بەژنا خوە
گرێددي •
ع ـ (التشدید والربط) •

( بەدرخان )
نافێ میرێ بۆتایە کۆ داویـــا
دەرەبەگیا کوردســـــتانێ ب
رهاکرنا وی هاتیە •
ع ـ (آخر امیر کوردی اقصی
عن الحکم) •

( بەران )
نێرێ مێشـــــنایە • بـــەران
نێرێ مـــەرە •
ع ـ (الکبش) •

( بەرن )

نافێ بازارەکـــی چـــەک وسلوڤاکي‌یە یا ئەلەماني‌یـــە • تۆ تفنکـــێ (بەرنـــو) ژێ دەردکەڤن •

( بەدەن )

سورە • بەدنا دیاربەکـــر ـ سوراوێ‌یە • : ـ سیا بەدنـــا دیاربەکەر لەمـــە گیربـــو خەنجەرا لاوکێ مالێ قەفـــت ئەلماس‌بو کالان زێربو •

ع ـ (اسوار المدينة) •

( بەنگین )

ئەو مرۆڤێ کۆ دچاخ و بەنگا خـــوەدە دژي • جـــوان و نوگهاي زیندارە •

ع ـ (الشاب) •

( بەردەشان )

نافێ گوندەکی یە • کۆ عـلی بەردەشانی شاعرێ نافـداریێ کورد ژوی گوندی‌یە •

ع ـ (قرية) •

( بەرهەڤدان )

کوم‌کـــرن ـ جڤانـــدن • بەرەف‌کرن کۆکردن •

ع ـ (اللم والجمع) •

( بەهـ )

یان بـهۆک ـ بیـــوک • بەرەکە زەر وگەورە دەرەنگ دگهێ • ژبـــەهۆک • یان ژ بیۆک ـ بینۆک • هاتیە •

ه ـ ( سفرجل ) •

( بەدەو )

جوان ـ خوەشک ـ سپهی‌یە• ژ ( بەدەو ) خەنکێ بادیێ ـ خەنکێ چۆلێ هاتیە • دەمـــا دبێژن کەچـــەکێ :ـ ئێ بەدەوێ ! یانی وەکـــە کەچێ عربێ بەدو جوان ودەلالـــە • چاوا ئەم دبێژن :ـ رەوشـــێ گورچی‌یەکە • وەکە کەچەکە گورچایە • • ه ـ ( حسناء ) •

## ( ب ـ آ )

( بـــرا )

ئەومێرێ کـــۆ ژ دێ وباڤێ مرۆڤە•یان ژیەکێ ژهەردوایە

:ـ براەك ـ براباف •
:ـ برام برایێ منــــه • ژدێ
وبابێ منه • براكێ منــــه
ـ ژدیامنه ـ برابێ منــــه ـ
ژبابێمنه • نەژدێیە •
د ـ ( الاخ )

( بــــرا )

ب( رێ ) یا فەلــەو ـ ژدل ـ
براستییە • :ـ برا بـــــارام
ژزندانێ دەركەیتـــــــه ؟ ـ
دەرچویه ؟ یانی ژدل ـ براستی
برام دەرچویه ؟ •
د ـ ( أصحیح ؟ ) استفهام •

( برازا )

كورێ ( برا ) یـــــه ـ بارام
برازایێ منـــــه ـ كورێ برایێ
منـــه • ژبرایێ من زایـــه ـ
زێــدە بویــه •
ه ـ ( ابن الاخ ) •

( بریڤا )

نافێ دو ایلێ كوردن • یەك
لناف دەقوریا لهێلا (آموده)
دكەفێ ویەك لرۆژهلاتێ

( ب ـ آ )

ژۆرێ بژارێ ( ستەورێ )
دكەڤێ • ( ســــیامەد ) ژڤێ
ایلێ یه • (خەجێ) سلیڤی یه
سلیڤا لژۆرێ بریڤانە •
ه ـ ( عشیرة كوردیة ) •

( بریڤكا )

گوندەكە • لناف بادینا یه •
( شـــــیخ نور الدین ) ژڤی
گوندییه • شاعرەكی مەزن
بو • وُلسەر رێچا قادرێ بو•
لسەر رێچا شیخ عبدا قدرێ
جیلانی بو •
ع ـ ( قریة )

( بهـــا )

نەرخ و نـــــەخت و قیمتە •
بهایێ تشت قیمەتێ وییـــه :ـ
زەمیـــــــــل فرۆش لاوكێ
دەرویشە •
كەرمكە وەرە ل پێشە
بهایێ سەلكێ خوە بێژە ••
ه ـ ( القیمة ) •

( براخوا )

یا براخۆ • برایێ كۆ خوەها
وی لجەم مرۆڤه • برایێ ژنا

مرۆڤه • برازنه •
ع ـ ( أخ الزوجة ) •

## ( ب ـ ت )

**( بست )**
هاسنكى زراف ودرێژه پێ
داغددن گۆشت دبرێژن •
شیشه • بستك ـ شیشكه •
( بست ) بداخوازا راسته •
وەكه بسته ـ یانی راسته
نەخوار •
ع ـ ( شیش ) •

**( بن‌دەست )**
وەكه ملەتێ كورده • چاوا
بن‌دەسته • ئێ كۆ دبن‌دەستێ
دژمن‌ده دژي •
ع ـ ( المحتل ) •

**( بنیات )**
كۆك وبنگه • دبێژن :ـ
ئەف گۆتنا بارام بێ‌بنیاته
ـ بێ كۆكه •
ع ـ ( الأساس )

## ( ب ـ س )

**( بلباس )**
ایله‌كه كورده ئه‌ڤداره دكه‌ڤی
سینۆرێ ایران وعراقێ• جاف
وبلباس لپەی هەفتێن •
ع ـ ( عشيرة كوردية ) •

**( بلعباس )**
چەمەكه • لژێرێ رۆژهلاتێ
( قامشلو )یه • چەمێ بالعباس
دناف آشیتاره دچی•وارێ‌مه‌بو
ع ـ ( اسم نهر في الجزيرة )

## ( ب ـ ج )

**( برج )**
دآسێ گەهێ كەڤناره‌ده
( برج ) هەبون ژبۆ كۆ تێ‌ده
شەر بكن • هەر چار
قوزی‌یێ آفانی‌یێ ب‌برج بون
هێزی دكوردستانێ‌ده برجێن
بلند وكەڤناره دكەنەه
وآسێ گەهاده خوه بسەر
بازار وێراناده پۆزبلندكن
باڤ وكالێ مه دوان برجا ده
وەلاتێ خوه پارستنه •
ه ـ ( برج معروف )

**( بلۆج )**
ملەتەكه • دناف‌بەرا هندو

ئیران دە پەرچەبویە •
بلوجستن وەلاتێ وایە •
ع ـ ( شعب بین الهند وایران)

( بلنیج )
گوندەکە لژێرێ بـزارێ
( قەمشلو ) دکەفی •

( برنج )
نافدارە • آفيیە گران‌بهایە •
سبي وزەر هـەيـە کورد
دبێژن :ـ خوارنا وە برنج‌بي
ئەز ناخوم • ژبەرکو برنـج
برومەت وگران‌بهایە •
ع ـ ( الرز ) •

( برێج )
گونـدەکـە • ل ژێرێ
( قامشلو ) دکەفی •
• ـ ( قرية )

## ( ب ـ خ )

( بن‌اخ )
نافێ وان شەبەشێ کو دخن
بن آخێ • دبێژن :ـ ئـەف
شەبەش بن‌آخە ـ یانی خستنە
بن آخێ •

ع ـ ( الاخضر مـن البطیخ
المدفون تحت الارض ) •

( بلالخ )
باژارەکی بچوکە دکـەفی
راژورێ ( بەدلیس ) • دەشتا
بلالخێ نافـدارە • هـن
دبێژن :ـ ( بلانخ ) •
ع ـ ( مدینة کوردیة قدیمـة
في شمال بدلیس ) •

## ( ب ـ د )

( بزد )
ترسە • بزدونەك ئێ کـو
گەلەك دبزدی ـ دترسـي •
بارام بزدیا ترسیا •
ع ـ ( الخوف ) •

( بـرد )
گەیاکە • دناف آفێ دە شـین
تێ • چیتـا زێ چێ دکن •
قامیشە ـ زلە •
ع ـ ( القصـب ) •

( بلنـد )
بارز واشکرا وبژوردە هلکشیا
یە • بارام بلند بویە • یا بەژنا

وی دریژ بو یه • یا روتبـــا
وی بەرزۆر بویە •
ع ـ ( المرتفع ) •

( بنيـاد )

کۆك و ژێدەرە • یا ئـــەو
ژبنیات هاتیە و یا بنیات ژبنیـاد
هتیـه • خـــانی •
داخەلقێ نەبێژتن کۆ ئەکراد
بێ مەعرفەتن، بێ أصلو بنیاد

( برێز )

سۆرانی‌یه • بشـــــەرەف ـ
ه ـ ( المحترم ) •

( بۆیژ )

دەنگبێژە ـ شاعرە ـ سۆرانی‌یە
ع ـ ( الشاعر ) •

## ( ب ـ ر )

( بزگور )

گوندە کە • لناف ( ئومەریا )
دکەڤی • کومێ بزگوری بناف
ودەنگن •
ع ـ ( قريـــة ) •

( بزمـار )

ژمسمار هاتیـە • ( میخە ) •

( بـــرر )

گەل ـ بۆش ـ پێش ێزیکی
هەڤن • بررك دەڤـــــە ـ
بۆشەك دەڤە • بررەك پەز
ـ گەلە ـ بۆلە • هڤـگەل •
ئەوەکۆ دو کەری پەز بەرخێ
خوە بەردن ناف هـــــەڤ •
( گەل ) بداخوازا کـەری ـ
برر ـ بۆش هاتیە ـ بەشە •
ع ـ ( قسم ) •

( بربر )

پەرچەپەرچە • بەش‌بەش •
وهارەنـــگە ( بربر ) دەنگێ
بلندو بێ تامە • وەکە ڤیرڤیر ـ
ڤرڤر ••• ع ـ ( القطعاة ) •

( بریندار )

ناڤدارە • ئەوێ کۆ بریـــــن
دبي • بریندارم • ژلاشێ من
هاتیــــە بررین • ( برین )
دراندنا لاشە •
ه ـ ( المجروح ) •

( بقـر )
تەڤرە ـ تەبەرەء دو دەڤێ وی
رکێ هەڤ هـــەنـە : یەك
زراڤ و بچوك ویەك مەزن
ۆ ستورە • لێ (تەڤر ـ تەبەر)
لجەم مە یەك دەڤـە • پێ
آشیڤا آڤي وزەڤیا دكن •
ە ـ ( اقدوم ) •

( بتر )
بتیا قەلەو • مرۆڤێ بپایـە
کۆ لێ ناخـــوي • دبێژن :ـ
بارام بترە دەخل کرە • یانی
بپەیەیە وتشـــتك دمالا وی
تونـــە •
ع ـ ( الفقير المتجرف ) •
:ـ وهارەنـگە ( بتر ) مرۆڤي
گەوی و دەولەمەنـــدە • لێ
دبي ئەڤ ژعربي هاتبي •

( بلـور )
آلافەکە موســـــیقایە •
دکوردستانێدە بلور نافدارە•
بلورڤان دســـــازا خوەدە
دلۆرینی • دەلۆردەلۆر •••
لۆراندن دەنگەکی بشواتە •
دێ ژزارۆکێ خوەرە دلۆرینی
دەنگێ بلورێ گلك شەواتە
دەمـــا مرۆڤ دەنگێ بلورێ
دکی ناچارە بسەر خــــوەدە
دپوژني • ع ـ ( انــاي ) •

( بنتار )
بێبنتـــــارە ـ بێجي ودەر
وشـــــــونە • دبێژن :ـ
بارام وندابویە بێبنتار چویەـ
بێگۆمان چویە ـ بێسەروشۆ
چویە ـ کـەس نزانی بکودە
چویە • گۆمان وخەبەرە •
ع ـ ( الخبر ) •

( بندار )
بندارا مرۆڤـا ( ژنـــــە ) •
دبێژن :ـ بـــارام بێ بندار
مایە ـ بێژن مایـــە • چما ژ
ژنێرە گۆتنـــە ( بنـدار ) ؟
ژبەرکۆ دکەڤي بنداری مێرە•
ع ـ ( كناية عن المرئة ) •

( بندار )
بنێ داری یە • دەمـــا دارا
دبرن دکن سێ پەرچـــە :

بن‌دار ، نافدار ، سه‌ردار • بن‌دار ستور وگران‌بهایه • هه‌روه‌ها ( بن‌دار ) لشونا ( بن‌ده‌ست ) هاتیه • دبن‌داریێ دژمن‌ده یانی دبن ده‌ستێ دژمن ده •
ع ـ ( المحتل ) •

( بن‌بار )

ده‌ما مرۆفه‌ك قه‌نجیێ بمرۆفه‌كی دكي ئێ كو قه‌نجي پێ هاتیه كرن بن‌باره یانی دبن ( منه‌تێ ) ده دمێني• دبێژن :ـ ئه‌ز بن‌باریێ ته مه تا هه‌زار سالي • یاني ته باره‌كی گران لمن كر كو ئه‌ز هه‌زار سالي نكارم ژسه‌ر خوه راكم •
ع ـ ( الذي احسن اليه غيره بدون مقابل ) •

( بهار )

سال دوازده مه‌هه :ـ سێ بهارن :ـ آدار ، نیسان گولان • هاڤین :ـ حه‌زیران ، ته‌موز ، ته‌باغ • پییز :ـ ایلۆل ، تشرینێ‌یه‌كم ، تشرینێ دوه‌م • زڤستان :ـ كانونا یه‌كه‌م ، كنونا دوه‌م ، سباط ) • ( بهار ) وه‌شه‌یه‌كی پارچیمه • ( بۆ ـ هر ) یانی بینا وێ ـ بهنا وێ هه‌اره ـ خێجه ـ خورته ـ زۆره • ژبه‌ركو ده‌ما گول وبینۆكا یه •
ع ـ ( الربيع ) •

( بوار )

ده‌هم ـ سه‌مت ـ ده‌رحه‌ق • دبێژن :ـ دبوارا دلۆڤان ده نه‌باش دپه‌یڤن ـ قسه دكن لێ نه‌راسته • ژبه‌ر كۆ دلۆڤان مرۆفه‌كی چێیه ـ چاكه ـ باشه • ل بوارا من رامه‌وه‌سته ـ ل ده‌هما من ـ ل سه‌متا من رامه‌وه‌سته •
ع ـ ( الحق والسمت ) •

## ( ب ـ ك )

( بفك )

ززارۆكاره تێ گۆتن • یانی

آگره ـ شەواته دوری هەرە•
( بقك ) بچوكێ ( بقــه ) •
بقكێيه • یاني نكاری دەستێ
خــوه بدیێ ـ دترســـــي ـ
نەوێري• ع ـ(للخطر والحذر
تستعمل للاولاد ) •

**( بلۆك )**

گوندەكه دكـــەفي ( چيايێ
مازی ) رۆژآفـــايێ باژرايێ
( ماردين ) • گوندێ كـــۆ
حەسنێ موسا ) لێ هاتيـــه
كوشتن سترانا حەسەنێ موسا)
دڤاواناده هەيه •
ع ـ ( قرية )

**( بلۆك )**

قـــەرميتێ شـــەمەنتۆنــه •
ژئەوروپي هاتيه •

**( بزدۆك )**

ئێ كـــۆ گەلـــەك دبزدی ـ
دترسي • دبێژن :ــ بـــــزرام
بزديايه ـ ترسيايه • من ئــەو
بزداند ـ من ئەو ترســـاند •
بزدۆنەكه ـ ترسۆنەكه •

**( بژانك )**

مووێ هەردو قراغێ چاڤن •
بژانگێ رەوشێ وەشيانه مووێ
چاڤێ وێ وەشيانه ـ پەرتيێنه•
ع ـ ( الاهداب )

**( بروسك )**

بەريقه وتيرێژێ ناڤ هەورانه
ـ بەرقـــه • دبێژن :ــ ايرۆ
هەورێ مه ـ عەورێمـــــه
برۆسكا ڤەددي • بەرەديی ـ
بەلەدي يا ڤـەددي • تيرێژێ
بـــدەنگ و رۆنـــاك ژێ
دقورژن ـ ژێ درژن •
ع ـ ( البرق ) •

**( برەك )**

هاسنەكه پێ دارا دبرن •
ع ـ ( المقطع )

**( بهۆك )**

يـا بيـــوك ـ بهنــۆك •
زهرميێ مەزتره دەرەنگ
دگهێ • ع ـ ( سفرجل ) •

( بسك )
دپۆرێ ژنا ده ئەو پەرچێ كۆ بسەر روێ خوه ده بەرددن• دناف بـــەرا گوهـ وروده بەرژێردبن • ( زلف ) بسەر ئەنيێ ده تێنه خوار وجارنـا دبن خفالۆك ـ گوريشك • تێ ( كەزی ـ گولي ) بناف ملاده زبانيڤه تێنه خـــوار • جـارنـا لپـاش وجــارنا بسەرسينگێ ده بەرژێر دبن•
ع ـ ( السوالف ) •

( بچوك )
دهەمبەر ( مـــەزن ) ده تێ • بارام بچــوكـه ـ نەمەزنـه • بچوك ـ كچكه •
ع ـ الصغير •

## ( ب ـ ل )

( بـــل )
ئەگەر ( ل ) قەلەو بي (كونه) ـ قونه ـ قوله • لێ كۆ (ل) نەقەلەو بي • بداخوازا ( غير ) تێ • ژبلتە غيری تە • ژبــل وەلات مەكەس نافێ •
ع ـ ( غير ) •

( بلبل )
يـــــن ( بول بول ) ـ ـ ڤێ چڤيكه كي نافدارە • شـــاعر خوه وەكە ( بلبل ) بـــەخت برەش دبينن • ســــــرانێ كوردی كەنەك لـســـەر ( بلبل ) پەيـــدا دبن • عرب ژي دبێژن ( بلبـــــل ) نافێ دەنگي‌يه • ژبەركۆ كـەلەك بەل‌بەل ـوبل ـ وبل ژدەنگێ وي تێ ژێرە تێ كـوتن :ـ ( بلبل ) •

( بسمل )
گوندەكه لناف بارافـــايه • لدەشتا دياربەكر دكەفي •

( بلال )
نافێ هەڤالـــەكي ( محمده ) دكۆكا خوەدە حەبەشي‌يـه • بدەنگێ خوه نافدارە •

## ( ب ـ م )

( بمبم )
يا ( بەم‌بەم ) ـ دەنگێ ديوايه

ـ دەنگێ تۆپایە • کۆتە لە
دەنگییە •
ع ـ ( کلمة صوتیة ) •

( برمبرم )
دەنگێ دەڤـــایە ـ دەنگێ
حشترە • دبێژن :ـ برمبرما
دەڤایە •
ع ـ ( صوت الابل ) •

## ( ب ـ ن )

( بـن )
بنکە ـ بنیات ـ بنیاد ـ کۆکە•
لێ ( بن ) جـــارنا بداخوازا
ژێرە • بن داررێ ـ ژێـرێ
داررێیە • دهەمبەر ( سـەر )
دە هاتیە •
ع ـ ( تحت ) •

( بتن )
کرنەکە • ژبون وبوین هاتیە
( تن ما ) لێ زیـدە بویــــە •
کوردستانا مەرکەزی :ـ بادینا
، هکریا ، بۆتا وخــەلکێ
هاویر بازارێ ( وان ) ولــۆ
دبێژن :ـ ئەڤ ایش نـابتن ـ
نابت ـ نابي • يێ ژبەر دـــۆ
ژبون دەرکەتیە نەدرستە کـۆ
ئەم ( ت ـ تن ) يێ زێـــدە
بکن •
ع ـ ( فعل الصیرورة ) •

( بستان )
یا ( بوستان ) • باغێ کـــول
وبینوکا یە بینکەهە ژبۆن کەهە
ـ جهێ بینێ یە • ( ستان )
جێیە •
ع ـ ( المکان المعطر ) •

( بسەرکەتن )
کارکرنە ـ فیدەکرنە •
ع ـ ( النجاح ) •

( بخوین )
یا ( بـخون ) • ئەوتشتێ کۆ
خـــون لێ بي ـ پێڤـــەبێ •
خوینینە •
ع ـ ( المدموم او الجریح )

( بدارقەکرن )
دبێژن :ـ رەوشـــێ مۆریکێ
خوە بـــدارڤـــەکرن • یانی
تەنزیم کرن ـ بتاڤە کرن• لێ
ژبەرکۆ بەرێ دارەکی زراف

دخستن سەرێ ( تا ) ودقولا مۆریکا فە دەربـــــاس دکرن بویە ( بدارفەکرن ) لێ دقابو بها تا گۆتن بتافەکرن •
ع ـ ( التنظيم ) •

**( بدارفەکرن )**
خنقانـــدنە ـ شــــنقاندنە • دبێژن :ـ بارام بدارفەکرن ـ شـنقاندن • ژکوردێ وەلاتێ دیاربکر بیرسن دزانن چـاوا گەرناس تێنە بدارفـــەکرن • ژبەرکۆ ( ٤٧ ) حەفت مرۆڤ بهفرە دشەڤا جـەژنا مەزن دە دســــالا ١٩٢٥ دە لبازارێ ( دیاربکر ) بدارفەکرن •
ع ـ ( الشنق ) •

**( بدارفەکرن )**
دالەقـــــاندن • دبێژن ـ وێ تفنگێ بدارفەکە دالەقینە •
ع ـ ( التعليق ) •

**( بزن )**
پەز هــــــەمي دو برە ـ دو بەرچەیە : ( بزن ) هەیــە و ( مێشن ) هــــەیە • یا بزني ومێشنيیە • پەزا مێشن نێرێ وێ بەرخ ، کاڤر ، هـۆگچ ، بەران • مێێ وێ ـ بەرخ ، کاڤرـ بەلەندیر مي• لێ(بزن) بەلەنـــدیر مي • لێ ( بزن ) نێرێ وان :ـ گار ـ گیسك هــــــەڤوری نێری • ( مێ ) کـــار ـ کیســــــك ـ تشتیر بزاتشتیر ـ بزن •

**( برن )**
بردنە • دبێژن بارام چەنــد مرۆڤ ـ پیاو دگەل خـــــود برن ـ بردن •
ع ـ ( الاخذ ) •

**( بررین )**
ژێکرنە • قطکرنە • دبێژن :ـ فەرهاد دار بري یانی دار ژێکر ـ قطکر • ( قەلەمبر ) ناڤێ وێ آلاڤێ کـۆ قەلــــەم پێ تێ بررین •
ع ـ ( براية ) •

**( برین )**
ژ ( بررین ) هاتیە • ژلاشێ بریندار تێ بررین ـ قولکرن ـ کونکرن • بارام بریندارە ـ یانیژلاشێ وي هاتیە بررین•
ع ـ ( الجروح ) •

( بژن )
ئێ كۆ ژن آنى‌یه • دبێژن :ـ
بارام بژنه • یاني شۆ كریه ـ
شۆ كردیه •
ع ـ ( المتزوج ) •

( بژین )
دهاوهاو وشاباشا ده تێ گۆتن
نو هاتیه چێكرن •
ع ـ ( عاش للجمع ) •
( بژی ) ـ ع ـ(عاش للمفرد)

( بلاندن )
دبێژن : بارام هنه‌ك بلیایه ـ
ڤربویه ـ هاشـــــت بویه •
راوه‌سیایه •
ع ـ ( السكوت ) •

( بلۆرڤان )
ئێ كۆ ل بلۆرێ دخي ـ سازا
بلۆرێ دزاني ـ زانایێ بلۆرێ
ع ـ ( ضارب الناي ) •

( بهنان )
ناڤێ مروڤه‌كی ڤه‌نه • ژبهن ـ
بێن هاتیه •

( بوین )
یا ( بون ) ـ ژێده‌رێ (كرنا)
بو یه • چێبون چێ‌نه‌بون •
ع ـ ( مصدر للصیرورة ) •

## ( ب ـ ئه )

( بسته )
ژسه‌ر بەستي هاتیه • دبێژن:ـ
بارام بسته چو مالا آغێ ـ یانی
سه‌ربه‌ســـــت چو • بێ ترس
چو •
ع ـ ( بجرأة ودون خوف )

( بیاره )
ناڤێ گونده‌كی كورده ل ناڤ
به‌را كوردێ عراق وكوردێ
ایران دكه‌ڤي • مـــالا شێخێ
بیاره و ته‌ویله ناڤدارن •
ع ـ قریة كوردیة ) •

## ( ب ـ ئو )

( بـــرو )
دسه‌ر چاڤا ره دو كه‌ڤـــــان
ژموا خـــویا دكن ناڤێ وان
( برو ) یه • ئـــه‌برو ـ برو
یه‌كن •
ع ـ ( الحواجب ) •

( بـدو )
گۆشـــتێ بەر درانا يـە ـ
گۆشـــتێ درانـــا يـــە •
بـدوێ مـــن تێشـــــن ـ
گۆشتێ درانێ من تێشي •
ع ـ ( الثغر ) •

## ( ب ـ ئي )

( بنداري )
کەبانی یە • کەبانیتي یە • ژن
دبێژن :ـ ئەز نکارم بنداريـا
تە بکم • يانی دبن دارێ تـە
دە رونم ـ رەنجبەريا تە بکم•
زۆر وزولما تە هلگرم •

( بن باري )
منەتە • نکارم بن باريا تـــە
ل خـوە قەبـول بکم • نکارم
منەتا تە هلگرم •
ع ـ ( المنـة ) •

( بـژي )
ژ ژينداري هاتيە • بـەرخوە
داری یە •
ع ـ ( عاش للفرد ) •

( بياني )
بێگانە یە • دبێژن :ـ بـارام
بياني يە • بێگانە يە • غريبە•
عَ ـ ( الغريب ) •

( بي )
دارەکە • بەرآڤێ يە • ( بي )
وشەنگەبي هەيە •
ع ـ ( الصفصاف ) •

## ( بۆ ـ آ )

( بۆتا )
يا ( بەختا ) نافێ ائيـلەکــــە
کوردە دکەڤی نێرەکـــــا
کوردستانێ • دەرەبەگيـــا
( بۆتا ) ناڤدارە • چيـــايێ
( جودی ـ گۆدی ) د دەهـم
وهەريما بۆتا دە يــە • گلك
ائێل دبن ڤي نافي دە هـەنە •
د ( بەخت ) دە رابوريـــە •
دەرباس بويە •
ع ـ ( عشيرة كوردية ) •

( بۆتيا )
مالباتەکە ناڤدارە • دناڤ ائيـلا
( زازا ) دە • عمر اغا بوتيـا
وبـرايێ وی صـــەبری اغـا
دشـــــەرێ دژمن دە هاتن

گوشـــتن • د ديوانا من ده
نافێ وان هاتيه •
عـ (اسم عائلة كوردية وطنية)

( بۆتكا )
يا ( بودكا ) و ( جـهمكا ) دو
بۆفێن زائيلا ( هەڤيركا ) •
ع ـ ( عشيرة كوردية ) •

## ( بۆ ـ ئه )

( بۆته )
ژبۆته ـ لۆته ـ بۆتۆيه •
ع ـ ( لاجلك ) •

( بۆدەره )
نافێ توزەكـه سپي يـــه •
بـلاشێ زارۆكـــا دادكن •
ودەما كوركرنا ســەريا بروێ
خوه زي دادكن • ئەوروپيـيه
ع ـ ( معروف ) •

( بۆسه )
ماچه• دەست بۆسين ـ دەست
ماچكرنه •
:ـ ( ب‌بۆسم ئەز لەبێ لالا )
ـ ئەز لێڤێ سۆر ماچيكم •
ع ـ ( القبلة ) •

( بۆغه )
گا وگامێشێ چاف ســۆره ـ
حێجـــه • ( بوغێبرێـــ )
مرۆڤەكى نافدارە • ب‌خورتي
ومێرانى دەنگ دابو • زائيـلا
بريفا ل هێلا ( آموده ) دما •
ع ـ (اسم رجل اشتهر بالقوة)

( بۆكه )
نافێ مرۆڤـــەكى كورده •
ژكوردێ شامێ‌يه• عزت‌بۆكه
دۆستێ مبو •
ع ـ ( رجل من اكراد الشام )

( بۆلگه )
هەريمه ـ منطقه يه • ئولكـه
ع ـ ( المنطقة ) •

( بۆمه )
ژبۆمه • لۆمه بداخوازەكى نه
كورمانج دبێژن :ـ بۆمـــه ـ
ژبۆمه • لێ ســۆرا دبێژن :ـ
بۆئيمه ـ لۆئيمه •
ع ـ ( لنــا ) •

( بۆمبه )
نافداره • هاسنەكى ژبـارودو
پێژوبەرا داگرتي يـه دشـەرا

ده چه‌که‌که دژوار وهلوه‌شینه ( بومبار دومان ) تارومـــــار كرنه ـ شه‌وات وويراني يه •

( بۆرمه )

ناڤێ وه‌لاته‌كي يه • دكـه‌ڤي رازێرێ چين وهـه‌م سنيۆرێ هندێ چيني يه •

## ( بۆ ـ ئۆ )

( بۆتۆ )

بۆته يه • به‌سته‌ي :ـ بۆتۆيه جنه‌كه‌شم بۆتۆ يه ، ماله‌كه‌شم بۆتۆيه • زۆرخۆشه •

ع ـ ( لـك ) •

( بـۆ )

بداخوازا چـه‌ما ـ چرا بۆچي هاتيه • ع ـ ( لماذا ) •

( بۆزۆ )

ناڤێ مرۆڤـــــه‌كي يه • ژبۆز هاتيه • ( بۆز ) دنـاڤ ره‌نگێ سپي وره‌نـگه‌كي دی ده يه •

يا شين‌بۆزه يا سۆربۆزه يـــــ ره‌ش‌بۆزه •

ع ـ ( اسم رجل ) •

ع ـ ( البياض الخليط مع احد الالوان ) •

## ( بۆ ـ بي )

( بۆبي )

ژكوچكێ بچـــوك ره تێ گۆتن • ژشـيراني‌يـــــه • ژئه‌وربي هاتيه •

ع ـ ( الكلب الصغير ) •

( بۆجي )

كورد ل شونا (بۆبي) دبێژن:ـ بۆجي • كوچكێ بچـوك • هن دبێژن : ـ بۆنجي •

ع ـ (الكلب الصغير)

( بۆچێ )

بۆچه ـ چما ـ چرا ـ لۆچي يه • ع ـ ( لماذا ) •

( بۆشي )

شاره‌كه ته‌نكه ژن ددن سه‌رێ

خوه • دبـــي ژ (پۆشـــي) هاتبي • ئەبرى وبۆشي وەكە هەڤن يا بخوه يەكن •
ع ـ (من الحرير الرقيـــق تختص بروس النساء) •

( بۆوی )
ژبۆوی ـ لۆوی بداخوازەكێ نە • ع ـ ( لـه ) •

## ( بۆ ـ بێ )

( بۆزێ )
ناڤێ ژن ومێرا یە • ژ (بۆز) هاتەیە،ژبۆ مێرا جارنا (بۆزۆ) تێ • وجارنا بۆزان تێ • ژبۆ ژنا جارنا بۆزێ وجارنا بـۆزا تێ •
ع ـ (اسم يصلح للرجـــال والنساء) •

( بۆشێ )
ڤالاتي یە • دبێژن : ـ ئـــەڤ گۆتنا تە ل بۆشێ چو • یانی ڤالا چو • دبي ژ تركـــی هاتبي • ژبۆش هاتبي •
ع ـ ( فارغ ـ فاضي ) •

( بۆڤێ )
جهێ ڤرۆتنا خوارن وڤەخوار نە • ژ ئەوروپي هاتيـــــە • مەیخانــە ونان خــــوارن وڤەخوارن خانە یە • هـــن دبێژن : ـ بۆڤیێ •
ع ـ (مطعم) •

( بۆمبێ )
ناڤێ بازارەكی ناڤـــدارە ل هنـدی یـە •
ع ـ (عاصمة الهنود) •

## ( بۆ ـ ت )

( بۆشات )
گوندەكە بتوتنا خوە ناڤـدارە ژاپـــلا سلیڤا یە • ل زۆرێ (دیاربەكەر) دكەڤي •

( بۆگات )
ناڤێ گوندەكی یە • ل هێـلا ( بەدلیسێ ) یە •

## ( بۆ ـ ج )

( بۆج )
یا(بۆدج) دبارزگانی وتجارەت

ده پەیدا دبي• تێ ئەز براستي
داخوازا وێ نزانم • تـــەنێ
دزانـــــــــم ژ سەرميـــــان
وسەرميانداري تێ ژمارتن •

## ( بۆ ـ د )

**( بۆند )**
دكاغزا ده وەزنەكه • يــــا
ژمارەكە •

**( بۆند )**
پارتيەكە جهويە • ل روســـيا
قەيسەرى پەيدا دبو •

**( بۆجاد )**
پارتيەكە سەرمايـــەداري يه •
ل فرانسا يه •

**( بۆلند )**
گوندەكە • ل ناڤ رەشكۆتـا
ل دەشتا بشێرىێ دكـەڤي •
(باڤێ‌فخريا) سترانەكـــــه ل
سەر صەبريێ حاجى محمـــد
آغايێ بۆلندێ چێ بويــــه •
چاوا كۆ (فەليێ قتۆ) ژي زڤي
گوندى وژڤێ مالباتى يه •
ع ـ (قرية) •

## ( بۆ ـ س )

**( بۆس )**
بوسه يه • دەرباس بويـــــەء
ع ـ ( القبلة ) •

**( بۆرس )**
بازارەكە ژبۆ پەرا يه• مەيدان
وسوك وچارچيا پەراتـێ ده
دفرۆشن •

**( بۆكس )**
كولمه • من بۆكســـــەك ل
دژمن دا ـ من كولـــەك ل
دژمن دا • ژ ئەوروپي هاتيه •
( بۆكسێر ) ئێ ب بۆكســا ل
هەڤ دخن ـ ل خەلكێ دخي•

**( بۆلس )**
ناڤێ كوردەكى فەلەيـــــه •
دبي يەك ژ شاگردێ عيســـا
بي • ع ـ ( اسم رجل ) •

**( بۆنس آيرس )**
بازارەكە • ل‌ئەمريكا راژيرە•
پاى‌تەختا ئەرژەنتينه •

( بۆت )

كون ـ قوله پنده • دبێژن : ـ
تليا من ل بۆتا وی ـ ل پـندا
وي ل قولا وی •

( بۆتبۆت )

ليزه‌كه • تليا خوه دخـــن
بۆتا هه‌ف : ـ چاڤێ يه‌كـــی
دگرن ـ گرێ ددن و زارۆك
نهاوير دگه‌رن وده‌ستێ خوه
نبۆتا وی دخن • ئه‌گـــه‌ر
يه‌ك ژوان گرت ئه‌و دكه‌ڤي
شونا وی •

ع ـ (لعبة كوردية) •

( بۆتبۆت )

نـــاڤێ تـه‌يـــره‌كی يـــه •
(بۆتبۆتك) •
ع ـ (اسم لطير) •

( بۆست )

پيڤانا ب تليا يه •
ع ـ ( الشبر ) •

( بۆد )

ئه‌و قه‌تعا نه آزۆتي يه • به‌ياره
عرب ژی ولۆ دبێژن لـــێ
ژكوردي هاتيه •
ع ـ (معروف) •

( بۆر )

ئه‌وجهێ كۆ مرۆڤ دآفـــاره
دمه‌ربلس دبي •
ع ـ ( المعبر ) •

( بۆز )

ده‌رباس بويه • ره‌نگـــێ •
دگه‌ل ره‌نگه‌كي دی دبـــي
(بۆز) دبێژن : ـ سه‌رێ مـن
بۆز بو يه • يانـــی ره‌ش و
سپي ته‌ڤلي هه‌ف بويه • مه‌هينا
بارام شين‌بۆزه • يانی سپـــي
وشين تێكه‌له • ره‌ش‌بـــۆز
وســـۆربۆز •• سپي‌ورده‌ش
وسۆروسپي يه •
ع ـ (قد مرت تفسيرها) •

( بۆغوز )

ناڤه‌كی ئه‌رمنـــي يـــه •
ل‌كوردستانێ گلك‌په‌يد ادبي•
ع ـ (اسم رجل ئه‌رمنی) •

( بۆغاز )

تركي يه لێ دكـــوردی ده

گلك پەیدا دبي • بۆغـــازا گەردەنێ • بۆغازا قرکێ •
ع ـ (الممر المائی) •

( بۆش )
بداخوازا (گلك) غلبه هاتیە• دبێژن :ـ بۆشەك دەڤــە ـ بۆشەك پەز • بۆشـــەك گامێش • بداخوازا زۆر ـپرـ کەلەك هاتیە •
ع ـ (کثیر) •

( بۆش )
ڤالایە • ژ ترکی هاتیـــە • گۆتنا تەبۆش چو ـ ڤالاچو • بۆش قسەدکی ـ ڤالاقسە دکی
ع ـ (الکلام الفارغ) •

( بۆغ )
بەنگین وچاف سۆرە • بـــۆغ بویە ـ چاف سۆر بویە •
ع ـ (الهائج) •

( بۆن جغ )
مالا بۆنجغ مالباتەکە ل زێرێ ( قامشلۆ ) رودنن •
ع ـ (عائلة کوردیة) •

( بۆتاڤ )
کەیاکە شـــیرکێ وی دژوارە دخن ناف دەستێ خـــوە • • دپالەیێ دە • دەمـا پەزدخوی آرنگي دبي •

( بۆ نگ )
وەکە (بوغە) هاتیە• چاڤسۆر ودچاخ وبەنگا خوەدە یـــە • بارام بۆنگ بو یە ـ کتیـــە بەنگا خوە ـ چاڤ سۆر بـــو یە •
ع ـ (عنفوان الشباب) •

( بۆل )
سەربەستي وخورتي یـــــە • دبێـژن : ـ مـــــن بۆلبۆل مەزنایـــي ل تە کریـــــە • بۆبۆل ئەزمالێ تە دخوم •
ع ـ (القوة او الدوام) •

( بۆل )
پەرچەپەرچێ پەز وسوالـــن• دبێژن : ـ بۆلەك پەز بەردە بەرە بێ سەر آفێ • یانـــــی پەرچـــاك پەز • بۆلـــەك دەڤە • بۆشەك دەڤەیە •

ع ـ (اقطيقان من الحيوان) •

**( بۆق )**
زيلا هن گەيا يە • بۆقـــــا
پيقزێ زيلا وێ يە • دەمـــا
پيقاز بۆق ددي پير دبي •

**( بۆقبۆق )**
ژخورتي وگەوي‌تي يـــــه •
دبێژن :ـ بۆقبۆق ژبارام تێ•
يانی چاف ســـۆر بو يـــه
راناوەستی • دگۆكا خـــوەدە
دەنگێ نێری و بەرانا يـــه •
دەما دكەڤن ناف پەز چاخـــي
گۆنێ پـــەز تێ نێری وبەرانـــا
بەردن نـــاف پـــەز • وێ
چـــاخێ بۆقبـــۆق ژوان تێ
پاشێ بويە رەنگ ودروفـــــا
مرۆڤێ گەوي •
ع ـ ( كلمة صوتية ) •

## ( بو ـ آ )

**( بوزا )**
خوەدائي هندۆســـايە • ژوان
رە تێ گۆتن (بوزى) ئۆلەكە
درۆژهلاتێ دوردە بـــــەلاف
بويـــه • دبـــي بەرمايـــێ
آگر پەرەسي بي •
ع ـ ( آلهة البوزين ) •

**( بـــورا )**
برايێ ژنا مرۆڤه • دبێژن : ـ
شێرۆ بورايێ بارامه ـ برايێ
ژنا وی يه •
ع ـ ) أخ الزوجة ) •

## ( بو ـ ئه )

**( بودەله )**
بوتەله • مرۆڤـــێ نـــەزان
وهۆڤه • دبێژن : ـ بـــارام
بودەله يه • يانی تشتەكـــی
نزانی ـ هۆڤه •
ع ـ (البسيط) من الانسان •

**( بوه ـ بويه )**
بداخوازا چێبون هاتيه •
ع ـ ( صار ) •

**( بوب )**
ناڤێ شـەيخەكی ناڤـــدارە ل
كوردستانا سوريا و تركيـــا
ئەڤ مالبات بەلاڤ بويـــه •
دبێژنه وان :ـ ( مـــالا بوبێ

گوري) • ئەڤ ملبات چـــاوا
دۆزا پایەداري دكن ولـــۆ
دۆزا میرانی ژي دكن •
ع ـ (عائلة كوردية دينية) •

( بـوز )
قەشەم ـ قەشا يە • دبـــي
ژ تركي هاتبي •

( بوك )
ژێره سنیۆرەك پەیدا نابي•
ئەم نزانن گەنگي بوكانـــي
داوي تێ ؟ رۆژا كـــــــۆ
كەچەكێ ـ ژنەكێ دخـوازن
دبي (بوك) • لێ كەنگـــي
بوكاني دقەدي ـ داوي تـــێ
نەدیار وئەشكەرآ يە• تا وەكو
دمري خـــەزور وخەســـو
دبێژن : ـ بوكا مە مريـــە •
وهارەنگە (زاڤا) ژي ولۆيە •
ع ـ (العروس) •

( بـوم )
تەيرەكە • ژ (كوند) مـــەزن
ترە • ب بێ‌ڤەنۆشي ناڤدارە •
ئەو جهـــێ كۆ (بوم) لـــێ
بخوینی دبێژن :ـ تۆيا وێ
كافل وێران ببي • لێ ئـــەز
ڤان چيرۆكا باوەر ناكم •
ع ـ (البوم) •

( بـون )
يا(بوين) ژێـــــدەرێ (كرنا)
بويـە • ئـەڤ كـرن كـێـم
وآلیكارە • بناڤ رە تێ دەمـا
كۆ آلیكاريي : ـ سواربون •
ژێدەرێ تێ‌نەپەرە • مـــن
ئەو سوارکر • ( سوارکرن )
ژێدەرێ تێ‌پەرە • دكرنێ دە
(سوار) پێكراوە • سواربو ـ
ياني فەرهاد بو سوار • لـــێ
د(ژێـدەر) دە پەرچیمـــە •
( سواربون ) لـســـــەرهەڤ
وەشەيەكە پەرچیمە • جارنـا
بداخـــوازا (كێان) دزمانـــێ
(عربي) دە تێ : ـ بـــارام
سواربو وهات كوشـتن • وێ
چاخێ گەرەكە (نەقرە) بكەڤي
سەر (سوار) • لێ كـــــۆ
(نەقرە) بكەڤي ســـــەر (بو)
بداخوازا (صار) دزمانێ عربي

تێ :- بارام سوار بو وگولە لێ کەت •

ع - ( صاروکان ) او ( الصیرورة والکینونة ) •

## ( بێ - آ )

( بێتا )

(تا) بەنە ـ آفداکە •

ع - (بدون خیط) •

( بێدا )

گوندەکە • ل‌ناڤ (رەما) یە • ل رۆژآفایێ کەڤەبازاڕێ (هەسکیف) دکەڤي •

ع - (قریة) •

( بێدیا )

گوندەکە لجەم ( بێدا ) یە •

ع - (قریة) •

( بێجگا )

سۆرانی یە • بداخوازا (باشقه) هاتیه •

ع - (غیر) •

( بێخوا )

بێخوەدێ یە - گاورە • سۆدانی یە •

( بێلونا )

گوندەکە • ل‌ناڤ (بۆتا) یە

ع - (قریة) •

## ( بێ - ئە )

( بێدوندە )

ئەوە کۆ پشتی مرنا دي زارۆ ژێ نەمانە • هین دبێژن :- (کوردوندە) •

ع - (الذی مات ولم یخلف ولدا) •

( بێلۆتە )

گۆڤەندەکە خوەندەوارێ خوەندەگەها ئۆل‌پەرستی دگەرنین - دلیزن • گۆیا نەدرستە تێدە لۆتا بافیرژن • لێ براستي گەرەکە ناڤێ وێ (بلۆتە) بوا •ژبەرکۆ گەنەک لۆتک تێدە هەنە •

ع - (للسماح) •

( بێتەرشە )

ئەو مرۆڤێ بێ اخلاقە - باوەر پێ نابي - هەموتشتێ نەباش دکي وجارنا

دکاري هن تشتێ باش بکي • بارام بێتەرشە یە • یانـــي مرۆف بێ باوەر نابـــي ـ هەرتشتي دکاری بکي •
ع ـ (رجل لا یبالی) •

## ( بێ ـ ئۆ )

( بێجۆ )
نافێ مرۆفەکی یە • ژ بێجان هاتیە •
ع ـ (اسم رجل) •

( بێخۆ )
بێ(طبیعة) • (خۆ) طبیعیة •
ع ـ (بدون اخلاق) •

( بێلۆ )
نافێ مرۆفەکي یە • دبـــي ژ ( بێدار ) هاتبي •

( بێزۆ )
نافێ ژنەکی یـــە • ژ(بێزار) هاتیە : ـ وەیلا بێزێ لتـــە بێزارێ ! سێفا ســـۆرێ لگولیا داری •
ع ـ (اسم امرأة) •

( بێشۆ )
نافێ مرۆفەکی یە •
ع ـ (اسم رجل) •

( بێلۆ )
نافێ مرۆفەکی یە •
ع ـ (اسم رجل) •

## ( بێ ـ ئو )

( بێدو )
بێدوخان ـ بێ دوکەلە •
ع ـ (بدون دخان) •

( بێرو )
ئەومرۆفـــێ شـــەرمیکار وفهیتکارە •
ع ـ (الرجل الخجول) •

(بێمو )
مرفێ روت وبێ پرچـــە •
بارام بێمویە ـ بێ ـ پرچە •
ع ـ (الاصلـــع) او بـــدون شعر •

## ( بێ ـ بێ )

( بێرتێ )
گوندەکە • لناف (ئۆمەریـا)

دكەڤي • بێزيكى هەزار مالي
تێ دە يە •
ع ـ (قرية) •

**( بێدێ )**

كـــارێ بێدێ ئـــــــەوە
كۆنەدجىيي خوەدەبي •

**( بێزێ )**

ناڤێ ژنا يە :ـ بێژێ كەڤۆكـا
بەلەكە • وەيلا بێزێ لـتـــە
بێزارێ •

ع ـ (اسم امرأة) •

**( بێزگێ )**

(حەسەنێ بێزگێ) دەنگبێژەكى
ناڤدارە لچيايێ مـــازى يە •
سترانا ( قادێ سيعدون ) ، و
(حسەنێ موسى) ژگۆتنـێ وى
نە •

ع ـ (شاعر شعبي) •

**( بێزارێ )**

ناڤێ ژنا يە • ژ(بێزە) هاتيـە
يا ژبێزاري هاتيە : ـ مەلايێ
جزيري دبێژى:ـ بێزي دكن
ژ قەنجا ژگەوروناز وغونجـا
قەدرێ گـولێ چـــەزانى
كەلبـــەش دڤێ كـــەرێ
رەش • يـاني بێ قيمـــەت
دبێنن ـ دورى دچــــن •
( بێزاري ) بێزمان وقـــــە
وگۆتـــن • يانـــى (حزين)
دبێژن : ـ بارام بـــێزارە •
يانى زمانێ وى ناگـــەرى ـ
زارێ وي ناگـــــــەري
دلنەخوەش وپەريشانە •

ع ـ (اسم امرأة) •

## ( بێ - بي )

**( بێجي )**

ئەوە كۆ جي ژێ رە نينـــە

ع ـ (بدون مكان) •

**( بێزى )**

دەرباس بويە • پەريشان •
ع ـ (حزين) •

**( بێرى )**

چونا ناڤ پەزە ژبۆ دۆتـــا

پەزە • ژنو مێر بهەڤرە دچن بێرێێ پەزێ خوە ددۆشن وبەرخ وکارێ خوە دان دکن •

ع ـ ( الحلب ) •

## ( بێ ـ ت )

( بێجۆت )

ئەوەکۆ جۆتێ وی تونەبی • دبێژن : ـ بارام بێجوتە • جوتێ وی نیە (جۆت) ئەوەکۆ دو سەوالێ وي هەبن کۆ بوان قادا خوە راکي ـ تۆڤێ خوە بچێنی • جوتکار ـ ئێ کۆ جوت دکي •

ع ـ (بدون فلاحة) •

( بێزەنت )

بازارەکی رۆما کەڤنارە یە • شەر دناڤبەوا کورد و بێزەنتیا دە گەلەک چێبویە • خەلکێ (بێزەنتا) ئێریش بخورتی تانینە قراغ ودەلاڤ و رۆژهلاتێ دەریا سیێ •

ع ـ (المدینة المعروفة) •

( بێرومەت )

بێقیمەتە ـ بێقەدرە بێشەرەفە •

ع ـ (بدون جاه) •

( بێروت )

پایتەختا لبنانێ یە • نێزیکێ (١٠٠٠٠) هزار کورد ل باژارێ بێروتێ هەنە • (رۆژانو) و (ستێر) دو رۆژنامێ کوردی بون لبێروتێ دەردکەتن • بەلاڤوکا بێروتێ بکورمانجی دەنگ وباسێ جهانێ بەلاڤ دکرن • لێ کۆ فرانسا ژ بێروتێ ـ ژ لبنانێ دەرکەت هەرتشت بێ زار ما وهاتە برین •

ع ـ (عاصمة لبنان) •

( بێقوت )

ژ کوردي وعربي تێکەنە (بێ) کوردیە و(قوت) عربیە • دبێژن : ـ مە ایسال قوتێ خوە داني یە قوتێ مە کێمە • (قوت) خوارنا سالێ یە •

ع ـ ( بدون مؤنة ) •

( بێگۆشت )

مرۆڤێ زەر و وەزا یە • گۆشت لێ کێمە • کێم

...ۆشتنه •

ع ـ (ضعيف الجسم) •

## ( بێ ـ س )

**( بێباس )**

بێ لۆ وندا بو یه وهیچ باسه‌ك ژی نابێ • بێگومانه بێخه‌به‌ره •

ع ـ (الضائع) •

**( بێداس )**

ئه‌وپاله یێ کۆ بێ داسه ـ داسا وی نینه • (داس) آلافه که پاله‌یا ده‌خلی وگه‌یا پێ دکن • بێداسه • یانی به‌تاله‌ـ بێ کاره • داسا وی نینه کۆ پاله‌یێ بکی •

ع ـ ( بدون منجل ) •

**( بێشانس )**

بێ سه‌عود • به‌خت ره‌ش • ژ کوردێ وفرانسی هاتیه • (شانس) ئه‌وربی یه ـ قرد ـ به‌خت ـ حظ •

ع ـ (بدون حظ) •

**( بێکه‌س )**

نافێ شاعره‌کی کورده پایه‌دار و بروه‌مه‌ت وسه‌ربلنده • ژ کوردێ عراقێ یه • دبی ڤارۆژا دیوانا (بێ که‌س) ده‌رکه‌فی • تاریخا ژینگه‌ریا بێ که‌س نقشته‌ك دوورودرێژ ژێ‌ره گه‌ره‌که •

ع ـ (اسم شاعر کوردی) •

**( بێکه‌یس )**

ئه‌و تشتێ کۆ نه‌ل‌کۆرا عاده‌تی یه • : ـ بێکه‌یسه • مرۆف لێ باوه‌ر نابی • کۆرفه‌رسه‌نده • : ـ که‌یسا مه ل ته هاتیه • مه زۆرا ته بریه •

ع ـ (خارج عن التقالید) •

**( بێمریس )**

ئه‌و تشتێ کۆ دلێ مرۆف نابژیێ • بێ مرێه • نه‌خوه‌شه نه‌چاکه •

ع ـ (غیر شهیة) •

**( بێمرۆس )**

ئێ رۆ نه‌خوه‌ش ـ ماد نه‌خوه‌شه ـ غم‌گیر ـ سه‌ردبه‌ر ده بێ که‌ن وقسه‌کرن •

ع ـ (العبوس) •

( بێهەوەس )
ئێ کۆ غیدیە • ناخـــــواري
ب کەسي رە مژول ببي •
ع - (الذى لا يحب التكلـــم
مع احد) •

## ( بێ - ج )

( بێج )
رەنگەکی شیرکی یە • وەکـە
رەنگێ گۆشتە • (بێجـــۆ)
نافێ مروفەکی یە • ژبێجان
هاتیە •
ع - (لون لحمى) •

( بێتاج )
ئێ کۆ بویە مــــەزن ۆتـــاج
وەرنە گرتی‌یە • وەک آغـــا
وبەگ ودیکتاتور •
ع - (غير متوج) •

( بێسوج )
ئـێ بـێ گونەهــــــە - بارام
بێسوجە - بێ گونەهە (سوج
گونەهە • دبێژن : - سوجـێ
تەیە گونەهێ تەیە • بێسوجە
- بێ گونەهە •
ع - (غير مذنب) •

( بێرەنج )
بێدژواری - بێزەحمەتـــي •
(رەنج) (تەعبە) - (رەنجبەر)
ئێ کۆ زەحمەت لـــــــەرە
زەحمەتکێشە • رەنجبـــەرێ
مالێ • ع - ( خادم البيت )•

( بێکنج )
تازي - روت - بێبـەرگ •
بارام بێ کنجە • تازی یـــــە
- روتە - بێبەرگە •
ع - (بدون لباس)
ع - (العارى) •

( بێکونج )
بێ قۆزی - بێ گۆشـــــــە •
(قونج - کونج) قوزی‌یـــــە
دبێژن : - کونجا خانـــــی -
قوزیا خانی یە • خانــــــــی
بێکونجە ، بێقۆزی‌یە •
ع - (الزاوية) بدون زاوية •

## ( بێ - ز )

( بێز )
وادیارە کـــۆ (بێز) دفـــردە

(سینگه) • دبێژن : ـ بارام وکەیۆ هەڤ هەمبێز کرن ـ یانی هەڤ دانه بەرسنیگا هەڤ • یان (هەمبێز) ل سەرهەڤ گۆتنەکە وێ چاخێ ل سەرهەڤ بداخوازا سنیگەه• کورد دبێژن : ـ وەره بکەڤە بەرهە مێزا من ـ یاهەمێزا من • یانی بکەڤە بەرسنیگا من

ع ـ ( المعانقة ) •

لێ ئەگەرژ (بێزی) هاتبی وێ چاخێ یا بدخوازا بەر گۆراندنه ـ پشتدانه ـ غەیدە ـ یان بداخوازا گازنده وچاڤ رەشی‌یه •

( بێدۆز )

بێداخواز ـ بێخوەستن ـ بێحەق • دۆز • (دعوا) وخوەستن وداخوازی یه •

ع ـ ( الطلب ) •

( بێسۆز )

بێبەخت ـ ئێ دەرەوین وبێ بەختە کۆ لبەێ سۆزا خوە ناچن • دئەڤیداری ده گەنەک خویا دکی •

ع ـ (المتقلب) •

( بێتۆز )

دەخل وچاندنی ده تێ • دبێژن :ـ ئەڤ کەنم بتۆزە ـ ئەڤ جه بێ توزه • ئەز دەخلێ بێتۆز دخوازم • ئەز گەنمێ بێتۆز دڤێم • یانی پاقژ ـ سادە •

ع ـ (الصافي من الحبوب) •

## ( بێ ـ ر )

( بێر )

هاسنەکی دەڤ پان وتوژە ڤێله دارکی ڤەرۆتی تێده یه • پێ کارێ خوە دکن • ژبۆ آخ وچامور وحەربێ‌یێ باشه • دبي ژ ( بررین ) هاتبي • زبەر کۆ آخ وگەیا دبرري •

( بێتۆره )

بێ ئەدەبە • تۆره دکورمانجی

( بێ ـ د )

ده شونا ( ئەدەب ) گرتیه •
( تۆرەڤن ) ئەدیبە • لێ ئەز
دبێژم کەرەکە ( هۆزان ) ناڤێ
ئەدیب وشاعربي • ژبەرکۆ
( هۆ ) بداخوازا ( علم ) و
( تنظیم ) هاتیە • ( هونان )
ژێدەرێ وێ‌یە • ئەگەر
( تنظیم ) بي • دبێژن :ـ پالە
باڤێ خوە هۆنایە • رەوشێ
بەنێ خوە دهۆنی •
لێ ئەگەر بداخوازا ( علم )
بي ژ ( هۆبون ) دەرکەتیە •
هۆبویە ـ هین بویە ـ ڤێربویە
:ـ ئێ تۆرە دکۆکا خوەدە
( أخلاقە ) پاشێ
بویە بداخوازا ( هوزان )
ع ـ ( شرس بدون اخلاق )

**( بێ‌دۆر )**

ئێ کو لجەم دەکتۆرا ـ
لجەم قەرراشا ـ لجەم
بەربەرا لهێڤیا دۆرا خوە
راناوستي • ژبەرکۆ گەلەک
پایەوارە • کورد دبێژن :ـ
ئەز قربانا وي مە کو :ـ لآشا
بێ دۆر ول ئسۆدا لزۆر
وحەقێ خوە دستینی بزۆر •
ع ـ ( المحترم او القوي )

**( بێ‌تۆر )**

بێ کارە • دبێژن :ـ بەرام
بێ‌تۆرە یانی کارەک بدەستێ
وی ناکەڤي • وادیارە کو
کورد لبەر آغا بون ـ لبەر
دەویا بون ژلەورا ئەڤ گۆتن
گۆتنە • ( بێ‌تۆر ) ئێ تورا
وي نینە کو باڤێرێ آڤێ ماسیا
بگری پێ دەبۆرا خوە
بکي • پاشێ بویە ( بێ‌کار ) •
ع ـ ( بدون عمل ـ بطال )

**( بێ‌بنتار )**

ئێ بێ‌ژن • ژ ( بن‌دار )
هاتیە • بارام بێ بنتارە
ـ بێ‌بن‌دارە • بن‌دار ژنە •
ژبەرکو کەتیە بن دارێ مێرێ
خوە • دڤردە ( دار ) (حکمە)
بن‌دارە ـ بن‌حکمە • لێ
ژ ( دار ) ـ چو هاتیە •
ژبەرکو ئێ کو دارێ وی

هەبو دبو هەرمانـــدار • یاني
ئێ زۆرچونە دبو فەرمانداو •
وەرد دبێژن :ــ دار زبهشتێ
هنێیـە • ئێ کۆ دارێ وي
ستوەرە ــ أرڤانێ وی هوەرە •
ع ــ ( بدون زوجة ــ غـــیر
متزوج ) •

( بێتر )
بداخوازا زێدە ترە • دبێژن:ــ
پارا بارام زپارا هەرهـەد بێترە
ــ زێدەترە ــ زۆرترە •
ع ــ ( أکثر ) •

( بێخێر )
ئەو تشتێ کۆ تێ دە خێر نینە•
دبێژن :ــ رەزێ مە بێخێرە•
یاني خێر تێدە نینە •
ع ــ (بدون ثمرة ) •

( بێکێر )
ئێ کـۆ ( کار ــ کرن ) زێ
نایێ ــ نـکری کارەکی بکي
ــ نزاني ــ یانکاری •
ع ــ ( کسلان ) •

( بێزار )
بێزمان ــ ئێ کـۆ دەڤێ وی

ناگەری ــ ژنەخوەشـــــي ــ
پەریشانی نکاري قسـە بکی ــ
بپەیڤي •
ع ــ ( عاجز ) •

( بێشەر )
ئەو مرۆڤێ کۆ تشتێ خەراب
زێ چێ نابن ئەگـــەر بکێر
شەر نایێ وئەگەر شـــــەر
نلخوازي نافێ وی بێ شەرە •
دبێژن :ــ بارام بێشـــەرە •
یانی شەرێ کەسي ناخوازی
یا زێ نایێ •
ع ــ ( سالم ) •

( بێکار )
بەتالە • بێ کار ــ بێفێدەیە •
دبێژن :ــ بارام بێ کـــارە ــ
بەتالە• ئەڤ کرین وفروتنا مە
بێ کارە ــ بێفێدە یە •
ع ــ ( البطال ) •

( بێمێر )
ژنەبي یە • دبێژن :ــ رەوشێ
بێمێرە ــ ژنەبیيە • یـــان
هێژ مێر نەکریە ــ کەچە •
ع ــ ( المرأة الغیر متزوجة ) •

( بێمار )
ێ بێمەهر • ( قەپاتمە ) ژنا
ئو میر بێمار ـ مەهر بکي ـ
ن جەم میرەکی رونی بێمەهر
ـ بێمار •
ع ـ ( المرأة غير المنكوحة ) •

( بێوار )
کوردونده یـــه ـ ئێ کۆ بێ
کور دمیني ـ یا کـورێ وي
پس دەردکـەڤن • دبێژن :ـ
بێوارە • وارێ وی شـــین
ەبويە • کوردونـــدەیـه •
وار کۆرە ـ کۆرئۆجاغە •
ع ـ ( الذي مـات وما خلف
ولدا صالحا ) •

( بێوار )
بێجي يه • دبێژن :ـ مـارە
نەجي‌یە نەوارە • بەرديوارمـ
بێوارە •
ع ـ ( الذي لا مكان له ) •

( بێیار )
ئێ کۆ دوستا وی تونـه ـ ئێ
کۆ یارا وی نینه • بێدۆست
ويار ـ بێأڤین ودل گرتنـه •

( یەر ) دوستا مرۆڤـــه • ئەو
کەچە ـ ئەوژنـــه کۆ دبي
دۆست ژمرۆڤ رە •
:ـ هەرچي یارا وی تونـــه
لهەردو دنیا بێکەسە • ئەڤ
کچک ـ ئەڤ ژنک بیـارە ـ
بدۆستە •
( یار ) ( صديقه ) ـ هەرچار
یارێ پەیغامبەر هەر چـــار
هەڤالێ وی‌نە :
ع ـ ( صديق ) •

## ( بێ ـ ش )

( بێش )
ئەو ستـاندنا کۆ دەرەبـــەگ
ـ آغا ـ زۆرکەر ـ حکومەت
ژملەت دســـتێني نەڤێ وێ
بکورمانجي ( بێشە ) •
ع ـ ( الضريبة ) •

( بێبەش )
بـسـۆراني يه • بێیـــار ـ
بێپشک ـ بێپایە بێپشکە ـ
بێبەشە •
ع ـ ( بدون حصة ) •

( بێتوش )
کوندەکە • ( مەلایێ بێتوشي)
ئەڤدارە نێ نزانم ل کویە ؟

( بێغش )
بێ حیـلە • ژکوردی وعربي
پێکڤە هاتیە چێکرن • ( بێ )
کوردیە • ( غش ) عربي‌یە •
ع ـ ( بدون غش ) •

( بێلاش )
بێ‌تەنە • ع ـ ( بدون جسم)

( بێماش )
بێ معشـە • کوردی وعربي
یە • ع ـ ( بدون معاش ) •

( بێهش )
بێ‌آقل وبێ‌سەودا یە• دبێژن:
بارام بێ‌هشە • بێ‌آقـــلە ـ
نەبیرەوەرە ـ نەزانە • هشـێ
وی نینە •
ع ـ ( بدون عقل ) •

( بێهۆش )
ژبێ‌هش دەرکتیـــە • یـان
بێ‌هش ژبێ‌هۆش دەرکتیە •
ع ـ ( بدون عقل ) •

( بێوەش )
بێ‌هێز ـ بێ‌قوتە • دبێژن :ـ
من وەشـەک دایێ ـ مـــن
تەقلەک دایێ ـ من هێرزەک
دایێ • من بارام دا بەر وەشاە
یانی من بارام بروآنی • دەمـا
خۆرت بنـاڤێ دلیزن ژوان رە
دبێژن :ـ بارام وەشا بـــدە
فەرهاد ! هەژە ـ هەژاندنە •
من ( تو ) وەشاندن ژســەرێ
دارێ من آنین خوارێ •
ع ـ ( بدون قوة ) •

## ( بێ ـ ف )

( بێباف )
مرۆڤی پیچـــە ـ بێژی یە •
دبێژن :ـ زۆرۆ بێ‌بافـــە ـ
بناوەرێ نـابي • ژخـــوە
فەدی ناکی ـ بەرخوە ناکەفي
ـ ژخوە شەرم ناکي • چـــە
تشتێ نەباش هەیە دکي •
ع ـ ( ابن الحرام ) •

( بێچاف )
کۆرە ـ بێ‌رۆناکە ـ بێ‌بیناهی
یە • ع ـ ( الاعمی ) •

( بێزراف )
بێجگەرە ـ ترسۆنەكە •
ع ـ ( جبان ) •

( بێشیف )
ئێ دەما شیفێ نەهاتیە وبێ شیف مایە • دبێژن :ـ بارام بێشیفە ـ شیف نەخوارىيە •
ع ـ ( بدون عشاء )

( بێكیف )
نەخوەشە ـ دلنەخوەشە •
بارام بێكیفە یانی كیفاوی نەێیە ـ دلێ وی نەخوەشە
ع ـ ( المهموم ) •

( بێماف )
سۆرانی یە ـ بێحەق •
( ماف ) حقە • لێ نزانم ژ ( معاف ) هاتیە یا ژكوهاتیە؟
ع ـ ( بدون حق ) •

( بێناف )
نافێ مرۆفەكی یە • جارنا كورد ژهەف دپرسن :ـ نافێ تە چیە ؟ ناكا ژبۆ كەمن وحەنەك دبەرسفا وی دە دبێژی نافێ م ( بێنافە ) •

ع ـ (اسم رجل او بدون اسم)

## ( بێ ـ ك )

( بێپەرك )
بلەزوبەز ـ بێهش وبیرەوەری • دبێژن :ـ بارام بێپەرك خوە آفێتە مالا زۆرۆ دبێ ژ ( بێپەروا )
ع ـ ( بسرعة ) •

( بێچەك )
دەستەڤالا یە • دبێژن : ئەز لبەر تە بێچەكم ـ دەستەڤالاەم ـ دەست هلنایم•
ع ـ ( بدون سلاح ) •

( بێچیك )
پرسیك ـ چیك • پێتێ • آگرن • دبێژن :ـ كورێ بارام چیك ژێ ناچن • بێچیكە • یانی تشتێ باشی ژێ نایێن • نكاری تشتێ بەش بكی • ل ناف كورمانجا ئەو ێ دزی ـ كوشتن ـ تالانا بكی چیك ژێ دچن لێ ئێ

کۆ کارەکی بدەستێ خوەبکی بێچیکە • نەژێهاتي یە • یاني چیکێ آگر ژێ ناچن ـ ژێ دەرناکەڤن •
ع ـ ( غير فطين ) •

( بێشك )
بێگۆمانـە • کوردی وعربي یە • دزمانێ کوردی دە گلك پەیدا دبي •
ع ـ ( لا شك ) •

( بێلوك )
پەرچاك لەشـــکەرە ( ٢٠ ) مرۆڤە • بێلوکەك عەسـکەر هاتە سەرمە • لێ مـــە پۆزێ وان شکاند ورەڤیان • ژترکي هاتیە •
ع ـ ( سرية من الجيش ) •

( بێلۆك )
چونا بێبەزە • بێلۆقـــە • گاڤێ خوە ژقادێ بلند ناکي •
ع ـ ( المشي بدون هرولة ) •

( بێریك )
بشیوەیێ هەڤیرکا ( بەریکە ) گرفانە • دەستێ خوە خستیە بێریکا خوە • دەســـتێ خوە لگرفانی خوە دانایە •
ع ـ ( الجيب ) •

( بێماك )
بەرخ ـ کار ـ آبێ دێ یە • دەما مي ـ بزن دمری بەرخـا وێ ـ کــــارا وێ بێ ماك دمینی • دبێژن :ـ ئەڤ بەرخ بێماکە • بێدێ یە •
ع ـ ( الايتام من صغار الغنم )

( بێحال )
ئەو مرۆڤی نەخوشە لبـــەر مرنێیە • دبێژن روســـتەم بێحالە • لبەر مرنێ یـــە ـ دکی بمری • گلك نەخوەشە ژکوردی وعربي هاتیە هف •
ع ـ ( المريض المختطر ) •

( بێحێل )
بێقوة ـ بێتینە ـ بێهاڤـلە • دبي ژکوردی وعربي هاتبي •
ع ـ ( الضعيف ) •

( بێدل )
غەمگینە • ناچارەیە • دبێژن:

بارام بێدلێ خوه سەد دینـار دانه من • بێرزا خـــوه ناچاره • بێدله ـ غـــەمگین ونەخوەش ومەسته •

ع ـ الحزین ) •

( بێشێل )

بێ کێسم ـ بێرەوشه • بـارام بێشـــێله ـ رەوشـــا وی نەخوەشکه ـ گرێـــدانا وی نەجوانه •

:ـ شێلا في سواري شـــێلا رزا یه •••

ع ـ ( الهندام ) •

( بێڤل )

پۆز ـ کەپو ـ لوت ـ فرنك هـــەمو بداخوازەکێنه • دپەسنێ هەســـپادە دبێژن :ـ سمکۆد وبێڤل زرنەیه • یانی بێڤلا وی وەکـــە دەڤێ زرنێ فره دبي • وادیاره هـــەسپێ سـمکۆد وبێڤلزرنـه بـەزا وهێژایه • دبێژن :ـ بێڤـــلا خوه پاقژکه ـ پۆزێ خـــوه پاقژبکه •

ع ـ ( الانف ) •

( بێقال وقیل )

بێ کـــۆتن ـ بێفردەوێدە •

( قال وقیل ) ژعربي هاتیـه •

مەلا خستیه ناڤ زمانێ مه •

ع ـ ( بدون کلام ) •

( بێکول )

بێدەرد وئەلەمە ـ بێنەخوەشی یه • بێکول وبێدەرد وەکـه هەڤن • ( کول ) نەخوەشـــي یه • تلیا من کول بویه • یـا برینداره ، یـا پژکێ تێ دە هاتیه• دلبکول ـ دلنەخوەشم کول وکۆڤان گلکێ جـــاران بهـــەفره تێن • لێ کۆف ـ کۆڤان نزانم ژکو هاتیه •

ع ـ المستریح ) •

( بێرم )

گۆلێ آفگیرانه • ئەز چومـه سەر بێرمێ ـ ئەز چومه سەر گۆلێ •

ع ـ ( البرکة ) •

( بێتام )
بێ ( طعمه ) • تاما ڤێ خوارنا وه نەخوەشــــه خوارنا وه ( بێتامه ) •
ع - ( بدون طعم وغير لذيذ )

( بێقام )
جهێ کوره • دبێژن :ـ ئەڤ گۆل بێقامه • یانی ژقامـــا مرۆڤ بێتره - کورتره •
ع - ( عميق ) •

( بێقرام )
بێخوەدی - ئێ - آ کـــۆ کەسي وی - وێ نینه کـــۆ خوه پێ بـــگری • دبێژن :ـ رەوشـــێ بێ قرامـه - بێ بێخوەدیيه • ( قرام ) گیاکه کۆ کا وی ژی ناقەلي • دناڤ آڤێ ده شین تێ • ( بێقرامه ) یانی قرام ژێ ره نینه کـــۆ دەستێ خوه پێ بگری • وەکه مرۆڤێ کۆ بـــکەڤي ناڤ آڤێ وقرام نەبي کۆ دەستێ خـوه باڤێژيێ •
ع - ( بدون معول ) •

( بێتین )
بێقوة - بێهێـزه - ( تـبن ) گەرميیا لاش وهەرتشتیيه • گلك دآگرده خـویا دكي • دبێژن :ـ تـــین دآگرێ وه نەمایه • قوة نەمایه • گەرمي نەمایه • تین دلاشـــێ من ده نەمایه • قوة وگرمي دلاشـــێ من ده نەمایه •
ع - ( بدون القوة والحرارة )

( بیتۆن )
ژهاسن وشەمەنتۆیه پشـــتا خـــاني یا پێدادگرن پراپێ آڤادکن کۆزك وچـــەپەرێ شـــــەر پێ چێ دکن ••• ئەورووپي یه هاتیه رۆژهلات •
ع - ( معروف ) •

( بێستون )
ناڤێ آڤانيیەکه بلند وکەڤاره لقەصر شێرین دکـــەڤي • بێستون بکورمـانجی یـاني تاقەکه مەزن وبلنده ستون تێ پەیدا نابن • لێ بفارســـي ( بەهستون ) ئەو آڤانیا کـــۆ

ستونێ وێ خوەشك‌وجوانن. جائەز نزانم كـه تاقەكـــه بێستونه ، یان بستونه وجوان ستونه ؟

ع ـ بدون عمد قصر شیرین

( بێجان )

نافێ مرۆڤەكی یه . وەهـــا رەنگه بێجان ئێ كۆجـــان دلاشێ وی نەمایه . یانینه :ـ ( جاندار ) هەیه ، ( بێجان ) هەیـــه .

ع ـ ( جامـد ) .

( بێدین )

گاورە . ئێ دینێ وی نینه ـ بێئۆله . دینــدار وبێدین . ئۆلــدار وبێئۆلن . ژكوردی وعربي هاتنه هەف . پێكهاتنه. ( دین ) عربي یه . (بێــدار) كوردی نه .

ع ـ ( كافر ) .

( بێژەن )

یا ( بێجەن ) . نافێ گەرنـا سەكی كوردە كورێ كەیـۆ سەرلەشكەرێ ایران ددەمـا پادشاهیا كەی خـــرۆ دە . چیرۆكا ( بێژەن ) دنـــاف كورداده نافداره .

ع ـ ( بطل كردي تاريخي ).

( بێژن )

ئێ كـۆ هێ ژن نـایـــه . دبێژن :ـ بارام بێژنه . یانی هێ ژن نانیه .

ع ـ ( غیر متزوج ) .

( بێزمان )

ئێ نكاری بەرسفا خوە چاك بـدی . دبێژن :ـ بــــارام بێزمانه ـ بێدەفـــه . یانی نكاري بەرسفا خوە بدي .

ع ـ ( الابكم ) .

( بێریڤان )

ئێ دچن بێرێ . (برێڤانێ) نافێ سترانەكێ یه . كەچكا بێریڤانه .

ع ـ ( الحلاب ـ حلابة ) .

( پێڤان )

لبەی ( فلان ) تێ . دبێژن:ـ فلان وبێڤان :ـ تاكیـــــد وبجیكرنه ژبۆ فـــلان .

دبێژن :ـ نافێ ته ناسناکم گازی دکم :ـ فلان وبێڤان •
ع ـ ( اسم مبهم ) •

( بێقون )
بێ کۆک ـ بێ بن • ( قون ) بنێ هەر تشتي یه ـ داویاوی یه • دبێژن :ـ ئەف کارەکی بێقونه ـ بێ داوی یه ـ بێ کۆکه • لێ نەکۆتەکە بتۆره یه • گەرکه لشونا ( بێقون ) بێداوي ـ یا ( بێ کۆک ) بێ گۆتن •
ع ـ ( بدون اساس ) •

## ( بي ـ آ )

( بیرا )
نافێ فەخوارنەکێ یه • دبێژن :ـ ژآڤا جه چێ دبي مرۆڤ بفەخوارنا وێ سەرخوەش دبي • گلەک نفشێ وێ هەنه • لێ ( بیرا ) ئەوروپي بهاتره •
ع ـ ( معروف ) •

( بیلیا )
نافێ آلافەکه مەکینا یه • چەند غارک دچەمبەرەکێ دە دگەرن • شوفیر ـ آژۆ ناسدکن •
ع ـ ( معروف ) •

( بینا )
یا ( بیناهي ) رۆناهي یاچاڤه ـ دیتنه • بیناهي یا چاڤا ـ رۆناهيیا وایه • بێبینایه ـ بێ رۆناهيیا چاڤه ـ کۆره •
ع ـ ( الاعمی ) •

( بیبسي کۆلا )
فەخوارنەکه • تەفایي یه • لهەردەر پەیدادبي • لشونا چایێ وقەهوێ ددن مێڤانا دهاڤینا ده بێتر برومەته •
ع ـ ( معروف )

## ( بي ـ ئۆ )

( بیرۆ )
ئەوروپي یه • ( خەزانا ) کنجایه • کنجێ خوه تێ ده بدارفەدکن ژتۆزو قەرێژێ

دپارێزن • وهارەنگە جامەکە مەزن ـ ( نەینك ) تێ دە یە• ژن ومێر خـوە لبـــەر چێ دکن •
ع ـ ( الخزانة ) •

## ( بي – ئي )

( بي )
دارەکە• بەرناگری ـ بێبەرە نقشك ژێ گەلەك جوانە :ـ پۆرێ وێ بسەردە تێ خوار ناڤێ وێ ( شەنگەبي ) یـە • دلگیر و دەنگێژ بەژن وپۆرێ یارا خوە وەکە شەنکەبي بی دبێنن ودبێژن :ـ شـــــۆخ وشەنگێ •••

( بي )
ژنابي یە ـ ژنـــــا بێ مێرە ـ بێبـــــەرە • ژێرە دبێژن:ـ ژنەبي ژبـــەرکۆ بیـــــە ـ بێبەرە وەکە دارا بێ بــــەر نادي • هـــن دبێژن :ـ بي • وهـــن دبێژن :ـ ( ژنبي ) • وهن دبێژن :ـ بیوەژن •
ع ـ ( السیبة ) •

( بیست )
کارتەکە ژمارێـــیە • دەهـ ـ بیـــــست • (٢٠) مرۆڤ (٢٠) سەوال (٢٠) تشت •
ع ـ ( عشرين ) •

( بیر )
هوشە • هاتە بیرا من ـ هاتـە هوشێ من • ژبیرا من چویە ـ ژهوشێ من چویە •
ع ـ ( العقل ) •

( بیرەوەر )
ئەو خۆرتێ کۆ گهایە دەمـــا خوە ـ بویە مرۆڤ• دبێژن:ـ ئەڤ کەچك بیرەوەرە • یاني قەنجي ونەقەنجي دزاني ـ بیرا دنیایێ دبي • ئەو کـــــەچکا بیرەوەر دئۆلا اســـــلامێ دە دەستلمێژا مێرا ژێ دشـکێ • زارۆکێ بیرەوەر دەستلمێژا ژنا ژێ دشکێ •
ع ـ ( الذي يفرق بين الخـير والشر ) •

( بیربر )
مرۆڤێ زانایـــە • دبێژن :ـ

بیربره یانی زانایه بیرا هـــهر
تشتي دبي •
ع ـ ( الذكي ) •

( بیبهر )
ایسۆته • لێ دکۆکا خــوه ده
( بێبهره ) دەرمانێ گەرمه •
هورو رەشــه • دەفێ مرۆڤ
دشەوتێني ـ گــــەرم دکی ـ
تۆژ دکی ••
ع ـ ( معروف ) •

( بیر )
چالا آڤێ یه • لێ نەکۆ ژآڤا
بـارانێ تێ داگرتن • بەلــکي
آڤ‌زێمه • آڤ ژێ دزێ لێ
بـسەر ناکەڤي • جارنا هەیـه
بسەرکەڤي عربيیه •
ع ـ ( البئر ) •

( بین )
بهنه • هلمه • بینـــا گولێ
خۆشه • بینا من دەرناکەڤي •
ع ـ ( الشم ) •

( پا ـ آ )

( پـا )
آلافەکه • ژبۆ خوەشـــــکرنا
ســـوندێ هاتیه • پا بـسەرێ
باڤێ خــوەکم نەراســــته •
پابسەرێته ئەز ولۆ ناکم •
وەکه ( جا ) تێ گۆتن • ژبۆ
خوشکرنا پەیڤێ یه •
ع ـ ( أداة للتحسين ) •

( پـا )
پاي ـ پار ـ پشك و بەشه •
دبێژن :ـ ئەز بێ پا مامه ـ بێ
پار مامــه ـ بێ بــەش مامه •
مالێ خوه لهـــەڤ پــاي کر
ـ پار کر • بەش کرد • ئەڤ
پشکا منه ـ بەشێ منــه •
ع ـ ( الحصة والقسمة ) •

( پـا )
بداخــوازا پي ـ پێ ـ نگ ـ
لنگ هاتیه • دەســـت وپـا ـ
دەست ولنگن • پاي تەخت ـ
تەخته پا جهی تـــــەخت وپێ
شاه ـ دەولەته • حکومەته •
ع ـ ( الرجل ) •

( پا پا )
سەرەك ئۆنداری عیسەویا ل

رۆما رودنى ـ دادنشـــــي • بعـــربي دبێژن :ـ ( بابا ) • فەرمانداریٚ کەنیسا یە • لێ گلك عیسوی ژ بن داریٚ وی دەرچونە پیٚ باوەر ناكن •

ع ـ ( الزعيم الدين المسيحي في رۆما ) •

**( پاشا )**

روتباکە لەشــــکری بو • ل شونا ( گەنەرال ) دهاتــــه گۆتن • وادیــــاره کــۆ ( پایێ شـــــاه ) بي • یانی لنگێ شــاه •

ع ـ ( الجنرال ـ اللواء ) •

**( پادشا )**

ژ پاشا بەرزۆر بویە بویـــه پادشـــا ـ پادشـــاه • دبێ ژ ( بادیشاه ) ( شــــادبادی ) هاتبي • ( ژین خوەشي ) •

ع ـ ( السعيد ) •

## ( پا ـ ئه )

**( پاتە )**

ئەوه کۆ مرۆڤ دەستێ خوە بلند بکی وســـــەرێ خوە پاریەك نزم بکي نیشـــانـــا سلاڤکرنە • لێ ( پاتە ) هـەر مللەتەك ل گۆرا دەســـتور و آوایێ وەلاتێ خـــوە پێك تینی :ـ هن دەســتێ خـــوە بـەرزۆر دکن • وهن دەستێ خوە ل سەر سەرێ خـــوە داتینن • وهن دەستێ خـــوە بەرژێر دکن ودبن سەرسەرێ خوە • وهن دگهێنن بـــەر سینگا خوە • وهن هـــەر تەنێ سەرێ خوە خوار دکن•

ع ـ ( السلام ) •

**( پالوتە )**

ئەوه کۆ خـــەلکێ گونـد بـهـــەڤره هـەرن پالەیـــا مرۆڤەکی ـ مالەکێ • ایـرۆ پالوتا مە یە • وێ پالێ گونـد هەمي بینە پالەیا مە •

ع ـ ( العمل التعاوني ) •

**( پاسە )**

پاسە • ئۆتۆمۆبیلەکە • ل ناڤ بازێر خەلکێ ب حـەق سوار

دكێ • دەرباس بویە • (باس) بكوردي ( پاس ) •
ع ـ ( الباص ) •

**( پاجه )**
پان جەرە یە • یانی پەرچە پەرچە یە ـ پنجری پەرچەبو ژبەركۆ ( پاجە ) چەنـد پەرچەیە بویە پەنجـەرە ـ پاجە • ژهەف پنجری یـه ـ زیڤارزیڤاری بویـه ـ پەرچەپەرچە بویە •
ع ـ ( الشباك ) •

**( پاچه )**
ژ ( پەنجە ) هاتیە • ( پەنج ) دەستە • ( پەنجـەشێر ) سریطانە • پێنجی (٥) دەهن• پێنج ( ٥ ) یەكن • ( پەنج ) ( ٥ ) تلی یە • ( كەلەپاچە ) ـ ژ ( كەلە ) و ( پەنجـە ) هاتیە • ( سەر وپێ ) نە •
ع ـ ( الروس والارجل ) •

**( پاڕۆنە )**
گۆ لكێ پاڕۆنە ئەوە كـۆ سالەك دسەر ڤە دەربـاس بوبي • یانی گۆلكێ پـار گـۆ لكێ سـالا چوني •
پاڕۆنە ـ یەكسالە •
ع ـ ( العجل الذي مر عليـه سنة ) •

**( پارچه )**
یا پـەرچـه • كەری یە •
ع ـ ( قطعة ) •

**( پازده )**
كارتەك ژمارە • پێنج زێـدە ژ دەها ـ دەهـ و پێنج ( ١٥ ) دناڤبەرا چاردە و شازدەهـ دە یە • ع ( ١٥ ـ خمسة عشر )

**( پاشده )**
بشـون دە یـە •
ع ـ ( متأخر ) •

**( پاكیزه )**
ژ ( پاكزادە ) ـ یا ژ (پاڤژ) هاتیە• پاكژە ـباڤژەـ نەگەماری یـە • لێ كۆ ژ ( پاكزادە ) هاتبي • ژ مالبـاتەكە پاك وپاڤژ چێ بویە ـ زایـە ـ زێدەبویـە •

ع ـ ( طيب الاصل ) .

( پاله )
ئێ كاركه‌ره . دوازده پاله ل جه‌م مه دخه‌بتن ـ دوازده كاركه‌ر ل جه‌م مه دخه‌بتن . پاله‌ڤان ـ پاله . ئێ دكارا ده پي‌يێ خوه دلڤێني ـ پي‌سڤك . پالڤێن ـ كركه‌رێ سڤكه . خه‌سما دپاله‌يێ ده گه‌ره‌كه پاله پي‌يێ خوه بلڤێني .
ع ـ ( العامل النشيط ) .

( پالگه )
باليف ـ به‌عليف .
ع ـ ( المخدة ) .

( پايه )
رومه‌ت و كباري يه . پايه داره ـ كباره ـ برومه‌ته .
ع ـ ( الشرف والحشمة والعظمة )

## ( پا ـ ئۆ )

( پالۆ )
گونده‌كه شاره‌كه . پاي‌ته‌ختا ائِلا ( دوملا ) ( زازا ) يه . دبي ژ ( پاله‌و ) ـ ( پەهله‌و ) هاتبي . وێ چاخێ ئه‌م كارن بێژن :ـ ( زاز ـ دومل ) په‌هله‌وي‌يێ كه‌ڤاره‌نه . زمانێ وا ژي وه‌كه په‌هله‌وي يا كه‌ڤاره يه . شارێ ( پالۆ ) يا گوندێ ( پالۆ ) ل ژۆرێ ( دياربه‌كره ) شيخ سعيدێ پاله‌وي ژڤي گوندي يه
ع ـ ( مدينة صغيرة كوردية شمال ديار بكر ) .

( پالتۆ )
ژ ( ساكۆ ) مه‌زنتره . ژبۆ زڤستانا باشه . ( پالتۆ ) ناڤێ چيرۆكا گۆگۆله .

## ( پا ـ ئو )

( پارسو )
ئه‌و هه‌ستي‌يێ خوار كۆ ل سينگا جاندار دگهێن هه‌ڤ . پارسوا بارام شكه‌ست . ژن پارسوا خواره .
ع ـ ( الضلع ) .

## ( پا ـ ئي )

( پاري )
په‌رچه . پاري‌يه‌ك نان ـ په‌رچاك نانه . پاريك

گۆشت ـ پەرچاك گۆشتە •
ع ـ ( القطعة ـ اللقمة )•

( پارتي )
ئەوروپي يە ـ بەندە ـ حزبە•
پارتي‌يا ديموقراط ـ بەنـدا
ديموقراطە •
ع ـ ( الحزب ) •

( پاتى )
يا ( پـەحتي ) چێبـوي ـ
پێكهاتي ـ سۆتاييى• دلێ بارام
هاتيـە پاتن ـ پـەحتن ـ
شوتاندنـە •
ع ـ ( الطبخ ) •

( پەحني )
يا ( پانى ) داويا پيێ مرۆڤە•
پانيا وى پاشـيا لنـگێ وي ـ
دبێژن :ـ ئـەڤ ژنك پاني
شەوتيە ـ يانى سەرخوەرە •
ژپان ـ پەحن ـ ڤرە هاتيە •

( پەحناهي )
فرەبونە • ع ـ ( العرض )•

( پاشي )
داوى يە • پاشيا ڤيێ‌تشـتي

نەباشە ـ داوى ياوى نەباشە ـ
نەچـاكـە •
ع ـ ( نهاية الشيء ) •

( پاكي )
نيڤ چاكى يە ـ باش يـە ـ
دناڤ بـەرا باش وپيس دە
هاتيە • ( پاكە ) يانى نـە
( باشە ) ونە ( خەرابە ) •
ع ـ ( لا بأس بە ) •

( پالەوانى )
يان ( پەهلەوانى ) ـ گەرناسي
وسڤگي‌يە ژ ( پي‌لڤاندن )هاتيە
ع ـ ( البطل ـ البطولة ) •

## ( پا ـ ت )

( پات )
پاتە • وەكە هـەڤ بونـە ـ
وەكەهەڤ كرنە • دليزتكى دە
دبێژن :ـ پاتەيە ـ پاتەكەت •
يانى ئەم وەكە هـەڤ بون ـ
يەك ژ مە دەرنەكەت •
ع ـ ( التساوي ) •

( پاسپۆرت )
كاغدەكە ـ دەفترەكە دكـاري

پێ لهەردەر بگەري .
ع ـ ( معروف ) .

( پارت )
پارتي يە . دەرباس بويە . .
ع ـ ( الحزب ) .

( پاس )
دلیزتکێ دە ( پاس ) بداخوازا ( چیزە ) . پاسکر ـ چیزکر. یانی ئەز نایم شەرێ تـە . ناکەڤم مەیدانێ خوە دکشێنم .
ع ـ الانسحاب ) .

( پارس )
ئەوە کۆ مرۆڤ ل بەر دەرێ خەلکێ بگەري ونان وخوارن وپەرە ... بخـــوازي . پارسەک مرۆڤێ کۆ پارســێ دکي .
ع ـ ( السؤال ـ الشحوذة ).

( پالاس )
نـــاڤێ ئۆتیـــلەکێ یـە . ل گەلەک باژارا ئـــەڤ نـاڤ هەیە . نەکوردی وعربي یە
ع ـ ( أوتیل پالاس ) .

( پارس )
پاي‌تەختا فرانسا یە . ناڤـدار وخوەشە .
ع ـ ( باريس ) .

( پاتۆس )
یا ( پاتۆز ) ناڤێ مەکینا پالەیێ یە . پالەڤانـــە .
ع ـ ( الدراسة ـ الحصاد )

( پاچ )
خەفتانە :ـ پاچ قماشــــــێ لێ‌لێ‌لێ ... کەوا وقەبا یە . ( پاچـک ) کنجێ کـــــەڤن وزیڤاری نە . ڤا پاچکا ژڤـر باڤێژە . ع ـ ( القباء ) .

( پاخ )
یا ( پاخاڤ ) ترسە . دبێژن:ـ پاخا ـ پاخـاڤـا ژبارام مەکـە دۆسـتە ـ هەڤالـە .
ع ـ ( الخوف ) .

## ( پا ـ ز )

( پارێز )
دکۆکا خوە دە پاراســـــتنە . پاشێ بویە ناڤێ ( بوستان ) ـ

پارێزێ مه ـ بوستانێ مه‌یه • چومه ناڤ پارێز • چومه ناڤ بوستان •( وه‌رزه ) • ژبه‌ركۆ تێ پاراستن ناڤێ وێ بویــه پارێز • ع ـ ( البستان ) •

( پارێز )
رۆژیا فله‌هایه ـ رۆژیا نویه • پارێزدگرن • داكۆ نه‌خوه‌ش نه‌كه‌ڤن • ئه‌ز بـــارێزم ـ دوهن ناخوم ـ تشتێ بته‌واش ناخوام •
ع ـ ( الصوم المدني ) •

( پاییز )
( ٣ ) مه‌هـ پاییز هه‌نه كــۆ دكه‌ڤن ناڤ بـــه‌را هاڤین و زڤستانێ • ایلون ـ تشرین آ یه‌كه‌م • تشرین آ دوه‌م •
ع ـ ( الخريف ) •

## ( پا ـ ر )

( پار )
سالا چوني يه ـ ســالا بورى يه • ( پێرار ) به‌ري پاره ـ پترپێرار ) به‌رى پێراره •
ع ـ ( السنة الماضية ) •

( پار )
( سفك ـ ته‌نك ) بشــه ـ پشــكه ـ پـا يه • پـارا مــن پشكا من ـ به‌شي من •
ع ـ ( الحصة ) •

( پاركر )
ناڤێ قه‌لـه‌مـه‌كـه جــوان وگران‌بهایه • وهاره‌نگه ناڤێ حبره‌كێ‌یه • قه‌له‌ما پاركر ـ حبرا پاركر •
ع ـ ( قلم وحبر ) •

( پاشگر )
د ( قواعد ) آواوده‌ستورا زمان ده پاشگر ئه‌و آلاڤ وپه‌رچێ كۆ پـاش گۆتنێ دگري ـ ل پاش تێ ، لێ نه ژ كۆكــا گۆتنێ يه •
ع ـ ( اللاحقة ) •

( پاشمێر )
ئێ پشتا مرۆڤ دشـــه‌راده دگرى • ع ـ ( المدافع ) •

## ( پا ـ ش )

( پاش )
دبێژن :ـ بارام ل پاش مایـه

ـ بشونڤه مايه ـ ل داوي
مايه • ع ـ ( الوراء ) •

## ( پا ـ ڤ )

**( پاخاڤ )**
يا ( پاخ ) ترسه • پاخاڤـــا
مه‌كه ـ مه‌ترســـــه • ژبارام
پاخاڤا ناكهم ناترسـم •
ع ـ ( الحذر والخوف ) •

**( پاشيڤ )**
خوارنا پـــه‌ي شيڤايـــــه •
دروژي‌يێ ده به‌ري سپيدێ
دخون • ع ـ ( السحور ) •

## ( پا ـ ق )

**( پاق )**
چيم ولنگـــــن • پاقـێ وى
ـ چيمي وى نــه • پاقا وى ـ
چيما وى يه • (مێ‌يه) • دهما
بێژن :ـ پاقا وي يه‌كه ـ پاقێ
وى ژيه‌كێ بهر ژۆره •
ع ـ (السيقان) •

**( پاقلۆق )**
ژ پاق هاتيه • لێ مه‌زن تره •
تێده كيماســـي هه‌يـــه •
پاقلۆقێ وى بنـــــه‌ره • يانى
نه‌خوه‌شك ونه‌جوان وكه ئێ
هۆڤانه •
ع ـ (السيقان الفاحشة) •

## ( پا ـ ك )

**( پاك )**
دناڤ به‌را باش وپيس ده يه•
دبێژن :ـ بارام پاكه • يانـــى
نه‌باشه و نه‌پيسه • ناڤ‌چه‌يه
ع ـ (الوسط) بين الجيـــد
والسيء •

**( پاك )**
بداخوازا پاقژه • پاكيـــزه ـ
پاقژه • يا پاك‌زاده يه • لـــێ
يا پێشي راســته • (پاكستان)
دهه‌مبه‌ر (سيخ) ده هاتيـــه •
بداخوازا (مسلمانه) پاقـژه •
سيخ دآورا پاكســـــتاني‌يا ده
قه‌رێژه هه‌رچه‌ندا لجهم مـن
مرۆڤ هه‌مو پاكه •
ع ـ (النظيف) •

**( پاتك )**
پشتا ستوێ مرۆڤـا يـــــه •

دبێژن :ـ تو پاتكا ستویێ خوە
ببینی هەو رەوشێ دبینی •
ژبۆ دژواری یە • یانی
بجارەك نكاری رەوشێ
ببینی هەروەكو نكاری پشتا
ستویێ خوە ببینی •
ع ـ (الرقبة) •

**( پاچك )**
دەرباس بویە كۆ ( پاچ )
خەفتانە • پاچك گەرەكە
خەفتانێ كەفن بی • لێ بویە
نافێ هەمو كنجێ كەفن •
ع ـ (الخرقة) •

**( پاچیك )**
نفشەك ژگارسە • بەری وی
هور وهشكە • نایێ خوارن •
ددن سەوالا • لێ كورد سالێ
گرانی دخون •
ع ـ (نوع من الزره) •

**( پارسەك )**
ئێ كۆ پارسێ دكن • (ئەك)
ژبۆ بێتری یە ـ گلك‌بونە •
یانی ئێ كۆ گلك پارسێ
دكی • لێ بچوكی وی نینە •

ع ـ (السائل) الشحاد •

**( پالك )**
دارەكە سەریكێ قالن ویەك
تەنكە • دخن نافبەرا
( مزانێ ) و ( پركێ ) داكۆ
شێفل نەبی • جۆتكار
ناس‌دكن •

**( پالك )**
بەرپالە • دبێژن :ـ گوندێ مە
دقێ پالكێ دەیە • ژ(پال)
هاتیە • (پال) تەنشتە •
پالاخوە بدە بالیفێ ـ تەنشتا
خوە بدە بالیفێ • پالا چێیێ
تەنشتا وی یە •

## ( پا ـ ل )

**( پال )**
نەوق وتەنشتە • پالا خوەدا
یە سەر بالیف ـ خوە بەردایە
سەر بالیف ـ تەنشتا خوە
بەردا یە سەر بالیف • :ـ پالا
چێیێ نەوقا چێیێ تەنشتا
چێیێ • لبەرپالێ رونشتن ـ
لبەر تەنشتا گر ـ چیا
رونشتن • بەرپالا گر ـ نەوقا

گره • تەنشتا گره (پالدان)•
ع ـ (الاتكال) •

( پاشل )
هندرویٚ كراس ژرەخیٚ سینگیٚ
ڤه • ع ـ (العب) •

( پایمال )
تالانه • بەرباتي یه • یانــــي
مالیٚ یەكی پای دكن ـ بەش
دكن • دەما مرۆڤەك بمری
مالیٚ وی پـــاي دكن ـ بەش
دكن هەریەك ژمرۆڤــیٚ وي
ژخوەره هنك دبي • پاشـــیٚ
بویه نافیٚ تالانكرن ـ بەربات
كرن •
ع ـ (تقسيم المال بين الورثة)ـ
النهب •

( پاخل )
پاشله لیٚ گەوشه ـ نەتكوزە•

## ( پا ـ ن )

( پان )
یا پەهن ـ پەحن • راســـت
وفره ودەشت وڤەكـری یه •
(فردەوسي) دبێژی ـ:
زسمیٚ ستوران دەران پەهنــە
دەشت زەمین شــــەش بوەد
آسمان گەشیٚي هەشت •
دكۆكا خوەدە پەهن ـ پەحن ـ
پانه • بەره بەره سڤك بویە•
( پاناڤ ) پەحناڤ ـ پەهناڤــە
ناڤەكە پانه ـ جیٚكي پانه •

( پاركرن )
پاي كرنه ـ بەش كردنه •
ع ـ (القسمة) •

( پارڤەكرن )
بەش كردنەوه • پايڤەكرنه •
ع ـ (التقسيم) •

( پاراستن )
خوه پاراســـتن ـ لخـــوه
آگاهداری یه • خوه ژدژمــن
بپاریٚزه لیٚ ئەوله مەبه • خوه
مەسیٚره دژمن •
ع ـ (الحزر والمحافظة) •

( پالەڤان )
كاركەره • ئیٚ كۆ پیٚ خـــوه
دلڤیٚني • كاریٚ خوه سڤـك
دكي • (پالەي) ژ پالەڤانـــــي
هاتیه • (پالەی) چنینا دخل و
گیایه •

ع ـ ( الحاصدون ) •

**( پالەوان )**
ئەڤژى ژ (پي ـ لڤان) هاتيە• لێ دكورمانجي دە ئەڤ (و) نەبويە (ڤ) ژبۆ كۆ ( پالەڤان ) ژ ( پالەوان ) بێ دورخستن • بڤي آواي ژهەڤ دانە آلي • ئێ كۆ بي‌بێ خوە سڤك دلڤيني ـ جان‌بازە • ددەمێ رابورى‌دە گەرناس وڤهرس بو • لێ ايرۆ بويە جان باز •

ع ـ (البطل) سريع الحركة •

**( پاكستان )**
وەلاتێ هندە • هنك ژوەلاتێ هندە • بەري چەند سالا ژهند جياواز بويە•فەرمانداري‌يەك سەرب‌خوە لدارخستيە • ( پاك ) بداخوازا ( پاڤژو مسلمان) هاتيە • (ستان) شونە ـ آلاڤەكە جي‌گە • پاكستان ـ وەلاتێ پاك ـ يا وەلاتێ پاكا •

ع ـ (معروف) •

**( پاسوان )**
كاغزەكە • ژ پوليس‌خانێ وەردگرى تا بشونەكێ و دەمەك دكارى هەرى وى وەلاتێ سنێۆر داشێ خوە كۆ نەدرستە بێ (پاسوان) و(پاسپورت) دەرباس بي ناڤ • ئەوروبي يە •

ع ـ (ورقة لاجازة المرور الموقت) •

**( پارخوان )**
هەردو تەنشتێ ران • ئێ ژپارە خويا دبن • جهێ بگۆشت وقەلەوە • يان هاويرا گوهانە ـ ناڤبەرا زك وگوهانە •

ع ـ (الورك) •

**( پارگۆن )**
كۆلانەكە ل پاش ( كۆن ) (رەشمال) دكۆلن • تاوەكو آڤ نەچي بنێ (كۆن) دكۆكا خوەدە (پاركۆنە) ـ پاش‌كۆنە پاشێ ژبۆ سڤكي بويە (پارگۆن) •

ع ـ (خط محفور حول بيت الشعر) •

**( پاردۆن )**

ئەوروپي يە • دمن ب‌بۆره ـ لێم ب‌بۆره • ل‌ناڤ كورمانجا جي گرتيه •

ع ـ (العفو) •

**( پايتۆن )**

تەختەرەوانە • ل‌پاش هەسپا تێ گرێدان • لێ تەختەرەوان ل‌سەر هەسپا دهاتە گرێدان •

ع ـ (العربية) •

**( پارزون )**

كيسەكە ژ‌كتان چێ‌دكن شير پێ دادكن بەرۆشێ‌و پيانێ • ئەزی شيرێ خوه بپارزێنم ـ ل‌پارزون بكم • ئەڤ پارزون ژ پاقژي‌يە • داكۆ گەمار دناڤ‌دە نەمێني •

ع ـ (المصفاية) •

**( پاش‌خوارن )**

ئەو خوارنا كۆ ژ‌بەر مێڤانا دمێني • دبێژن :ـ ئەز پاش‌خوارنا خەلكێ ناخوم •

: ـ ژبۆ سەوالا ناڤێ وێ (نەش‌خوەرە) • نەش‌خوەرا هەسپێ بارام بەردانە بەرهە سپێ فەرهاد • هەسپێ من نەش‌خوەرێ ناخوی •

ع ـ (الفضلات) •

**( پاش‌گۆتن )**

ئەو گۆتنا كۆ مرۆڤ ل‌پاش هڤالێ خوه دكي • مرۆڤێ دورو ولۆ دكي • دروێ هەڤالێ خوەدە خوەش دبێژی لێ ل‌پاش هەڤالێ خوه نەباش دبێژی • ائريشي وي دكي •

ع ـ (سب الناس في غيابهم) •

**( پاشكەوتن )**

يا (پاشكەتی) ب‌شوندە مانە

ع ـ (تأخر) •

:ـ پاشكەتی ـ پاشكەوتي

ع ـ (متأخر) :ـ بپاش‌دە ماي ـ ب‌شوندە ماوە • ئەو كەسي كۆ ب‌شوندە مايە •

ع ـ (المتخلف ـ المتأخر) •

**( پاشدەچون )**

چونا پاش‌دە يە ـ شوندەچونە•

رەڤەكە يا تاكتيكە •ياشكەستنە دشـــەرادە پاش‌دەچـــون وپێش دەچون هەيە •

ع ـ (التراجع) •

**( پاشڤەچون )**

چونا بەرەپاشە ـ بـشـــون خوەڤە دچي بێ‌كۆ بەرێ‌خوە بگۆري •

ع ـ (القهقرية) •

**( پاش‌خستن )**

ئەوە كۆ يەكێ مرۆڤ ل پاش بهێلي بـچـەآواي‌بي • ل‌پاش هشتنە • كرنا وێ تێ‌پەرە •

ع ـ (جعل الشيء في المؤخرة)

**( پاشڤەدان )**

رەڤا ژگونەهبــاري يـــە • دبێژن :ـ خوەپاشڤەمـــەدە • ياني مەرە ـ وەرە مەيـدانێ بەرسڤا خوە بدە • وەكـــە ميرابە •

ع ـ (التهرب عن المسؤولية)•

**( پاشڤان )**

ئێ كۆ بـشڤان رە بـشـــڤ دچي ـجۆلێ ـ دچي شەڤينێ •

پشتەمێرە •

ع ـ (المدافع والمساعد) •

## ( پـا ـ ە )

**( پادشاە )**

پادشا يە ـ كەيي وكـســـرا وسەردار وفەرمانـــــدارە • دەرباس بويە •

ع ـ (الملك) •

## ( پا ـ ي )

**( پالەي )**

چنينا زاد وگيا يـــە • ژپالە ـ پالەڤان پي‌لڤـان وپێ‌لوانـە ـ پالەيا جها • پالــەيا گەنمـا ـ پالەيا نيسكا •

ع ـ (الحصاد) •

## ( پە ـ آ )

**( پەنەما )**

بۆغازا (پەنەما) ناڤدارە •

**( پەيا )**

مرۆڤێ نەسوارە • دهەمبـــەر سوار دە تێ • چەند پەيـــا وچەند سوار •

ع ـ (الرجل ـ الراجل) •

( پەیدا )
هەبونە • پەیدا بکە • پەیدا نابي ••• هەیە ـ نیە •
ع ـ (الوجود ـ الأجاد) •

( پەیروزا )
ناڤێ ژنەکی یە • ژ(فەیروز) هاتیە • گەوهەرەکی گران‌بها یە • ع ـ (امرأة) •

## ( پە ـ ئە )

( پەرە )
یان (پارە) ناڤدارە • پەرچە• پار ـ پەرچە • پاری یە •
ع ـ (القطعة) •

( پەردە )
چارچەفە • یان ددن بەر پاجە ودەریا • ژن ژی ددن بەر خوە :ـ ژبەر پەردێ دەرێ •
ع ـ (الازار ـ المیزر) •

( پەرچە )
پارچە یە • پارا بچوکە • (چە) دڤردە بداخوازا کچکە بچوکە •
ع ـ (القطع الصغیرة) •

( پەروە )
یا (پەروا) ـ نیشان و خەلاتە• پەروە لێ کر ـ خەلات لێ کر ع ـ (الخلعة) •

( پەلە )
گرارا شلەکە • دبێژن :ـ گرارا تە پەلەیە • یانی شلەکە • نەزوایە •
ع ـ (غیر ناشف) •

( پەلە )
پەرەنگێ آگرە•یان کەفرەکی نیفچەیە • سۆرا دبێژن :ـ پەلە ـ پەرەنگ • کورمانج ژ کەفرێ نیفچە رە دبێژن : پەلە • :ـ من‌پەلاکی کەفرا ل بەلەگۆشکا فەرهاد خست
ع ـ ( الجمرة والحجر الوسط) •

( پەمبە )
رەنگە کە • دناڤ بەرا سۆر وسپي دەیە دبێژن :ـ ئەف رەنگ پەمبە یە• یانی نەسۆرە و نە سپي یە •
ع ـ (ما بین الاحمر والابیض)

( پەنجە )
نافيێ کەلبەتانە ـ لەپە • ژ بەر
کو (٥) تلي تێدە هەنە تــێ
گوتن (پەنجە) • (پەنجـــا)
بسوراني پنجي‌يە • (٥٠) •
پەنجا مروڤ (٥٠) پنجي‌مروڤە
• (٥٠)
ع ـ (الکف) •

( پەنجەرە )
(٥) راهە ـ (٥) رێ يە •(٥)
دەرى يە • واديارە کـــو
ددەمێن بوری‌دە پەنجــەرە ـ
پێنج دەري تێدە هەبــون •
ايروژی دپەنجەرا مەدە پێنــج
دەری هەنە •
ع ـ (الشباك) •

( پەنسە )
کەلبەتانە • پەنجەیە • دبي ژ
ئەوروپي هاتبي •
ع ـ ( کلبتان ) •

( پەڤرە )
تەڤدە ـ دگەل‌هەڤ ـ ڤێکـرە
بداخوازا (گش) هاتـــــە •
پەڤرە وەرن • دگەل‌هــەڤ
وەرن ـ پێکڤە وەرن ـ ڤێکرە
وەرن •
ع ـ (المجموع) •

( پەمبۆ )
نافدارە • ع ـ ( القطن ) •

## ( په ـ ئي )

( پەری )
ژنێ جني نــە • پەري‌زادە •
آ کو ژ پەری‌یا چێبویــە ـ
زێدە بوە • گول‌پەري ـ گولا
پەري‌یا یە • یا پەرێ گــولا
یە • ع ـ (الحورية) •

( پەری )
پـــــەرە • پەروبـــــازکێ م
شکەستن • بێ‌پەرە پـــــەرێ
تەیرا • پەری دبەر ســـــەرێ
بارام دە یە • تەیرێ بـــێ
پەر • ع ـ ( الرياش ) •

( پەندي )
بداخوازا ئەشکەرا وخویـــــا
ودیارە • (دقواعدا) من دە •
(پەندی) کرنا کو (کروکێ)
وێ ئەشکەرایە • (نەپەنــدی)

كرنا كـو (كروكـێ) وێ نەئەشكرايە ـ وندايە •
ع ـ (العلانية) •

( پەز )
ژ بزن و مي‌يا رە تێ گوتن • بزني ومێشني دەما دبێـژن :ـ پەزێ مە مێشن وبزن تـەڤ دكەڤن بەر • ژ پـەز پێڤە ژ سەوالێ دی رە تێ گوتن : ـ (سەوال) ـ دەوار • سەوالـێ مە هاتن ـ دەوارێ مە هاتن •
ع ـ (الاغنام) •

## ( پە ـ ك )

( پەك )
آلافەكە عجێبە • وەكـــە (هەك) تێ گوتن • دبێژن :ـ پەك ! مالخەرابو ! تە چـە كريە ؟ •• ايزيدی دبێژن :ـ ( ايش ) ! كورو ! تە چـە كريــە ؟ هـن دبێــژن :ـ ئەررك ! تە چە كريـــە ؟ هڤێركا دبێژن :ـ هەك ! تە چە كريە ؟
ع ـ (أداة للتعجب) •

( پەلك )
دارپەلك ـ چلكانـدنا دارە ـ لیزەكە • دارەكي بچـوك ـ نافێ وي (ڤیتك) ە • لسـەر قادێ داتێنن وبدارپەلك لـێ دخن • بلند دبي و دور دچي
ع ـ (نوع من الرمي) •

( پەنك )
تایێ رستي كو دكـــن غازول
ع ـ (الشلل) •

( پەلك )
هن پەرێ زیڤ ـ وزێرن • ژن ددن بەر روێ خـــوە ـ بكومێ رەشاندی ڤە ددرون• :ـ وهارەنگە (پەلك) ژ پەلێ چفارێ رە تێ گوتن • پەلكێ چفارێ •
ع ـ (الورق) •

( پەرەنگ )
بزوتێ آگرە •
ع ـ ( الجمرة ) •

( پەیك )
قاصدە • ژ پەیاك ـ پەیــا هاتیە • لێ مـــە (پـــەیك) وندا كریە • ئەم دبێـــژن :ـ

(قاصد) عربي‌يه • ته‌نــــێ
ده‌نگبێژ وشاعــرێ كــورد
(په‌يك) دديوان و سترانــێ
خوه‌ده وندا نه‌كرنه •
ع ـ (الرسول) •

( په‌شك )

نقط • پــه‌شـــــكه‌ك آڤ ـ
نقطه‌ك آڤه • په‌شككك ده‌و ـ
فـــرك ده‌وه ـ قورتـــه‌ك
ده‌وه • په‌شكێ بارانێ (نقطێ)
بارانێ نه • دبێـژن :ـ دورى
من هه‌ره وێ په‌شكێ مـن ل
ته كه‌ڤن • يانى به‌لا مـــن
بگهێ ته‌ژي وێ بــه‌لا مـن ل
ته كه‌ڤي •
ع ـ (النقاط) •

( په‌پوك )

ناڤێ چڤيكه كێ‌يه سه‌ربه‌رژێر
خوه بداراڤه داله‌قاندى دهێلي
هه‌تا دلۆپه‌ك خوين ژپۆزێ
وێ تێ • دبێژن برايــێ وێ
مريـــه لسر ولۆ دكي • لێ
باوه‌ر ناكم •

## ( په ـ ل )

( په‌ل )

روپه‌ل ـ راپه‌له ـ نيڤ په‌نه‌ه
(په‌ل) ژ هه‌ردو روێ كاغزێ
ره تێ گۆتن • (روپـــه‌ل) ژ
روكي كاغزێ ره تێ گۆتن •
سۆرا دبێژن :ـ (لاپه‌ر) •
ع ـ (اسم يطلق على كـــلا
صفحتين من الورق) •

( پــه‌ل )

په‌لێ دارا ـ په‌لــێ ره‌زا ـ
په‌لێ گه‌يا •
ع ـ (ورق الاشجار وغيرها)•

( په‌ل‌په‌ل )

په‌يڤا كۆ ژێ نايێ زانــين •
دبێژن :ـ چه‌په‌ل په‌لا ته يه ؟
يانى چه په‌يڤێ ته‌نه كــــۆ
تشتك ژێ نايێ زانـــين ـ
په‌يڤێ پوچن • :ـ دكۆكـــا
خوه‌ده (په‌ل‌په‌ل) ده‌نگـــێ
كه‌لاندنێ‌يه • دبێــــژن :ـ
په‌ل‌په‌لا آڤێ‌يه • يانى گه‌له‌ك
دكه‌لي • له‌ملــــه‌م ويه‌ل‌په‌ل
ده‌نگن •

( پەلول )
خوارنەکە •ژ(آرد) چێدکن•
شلەکە ـ پەلەیە • ژلــەورا
ژێرە دبێژن :ـ (پەلول) •
ع ـ (نوع من الاكل) •

( پەرتال )
جل وجاوێ سوکێ ـ بازارێ
نە • دبێژن :ـ پەرتالێ دکانا
بارام گەلکە ـ زۆرە • پرتـي
وپەرتال جارنا لپەي هــەف
تێن :ـ بێپەرتي وپەرتالن •
ع ـ (البضائع) •

( پەرگال )
کێسم و رەوشا مرۆڤا یــە •
دبێژن :ـ بــێ پەرگالــــە ـ
بێرەوشە ـ بــێفەســالە •
بێکەیسە • گلک جـــارا
(کەیس وفەســال) لپــەی
هەف تێن •
ع ـ (الوضع) •

( پەرگال )
آلافـــــەکە • پێ خێزێ
هەندەسێ چێ دکن • قەلەمێ
دخـــن ســـــەریکي وێ و

دزیفرێنن •
ع ـ ( فرجـــال ) •

( پەترۆل )
گازومازو نفط و ژێچودەرێ
وێ نە • نەکوردییــە • لێ
کەتیە کوردی • چاوا کەتیــە
زمانێ عربي •
ع ـ ( معروف ) •

( په ـ ر )

( پەر )
پەری یە • دەرباس بویــە •
دسۆراني دە • بـداخــوازا
( پەل ) هاتیە • ( لاپــەر ) ـ
روپەلــــە • ( لا ) بداخوازا
( آلي ) یە • ( لاپـــــەر ) ـ
لایەک پەر ) رووەک پەنە ـ
آلیەک پەلە • لەجەم خلکێ
سلیماني وهەولیرێ ( ل ـ ر )
بهـــــەف تێنە گوهــەرتن •
( گول ـ گور ) •
ع ـ ( الريش ) •

( پەنیر )
یا ( پەنیر ) ژ شیر چێدکن •
پەنیرێ کۆچەرا ـ زۆزانـــا

بنـــاڤ ودەنگە • پـــەنیرێ بسیرک ل ناڤ کۆچەرا دخن چـــەرما ودهێلن • شـیخ عبدالرحمن ئێ آختەپي دبێژي:
پەنیرێ قەرەژداغێ نانێ گـــەنم
شەبەشێ لبەر چەم بەنم‌در بەنم•
لبەغـــدا پەنیرێ کوردي گرانبها یـــە • کیـــلۆ بەهەشت‌سەد فلسي یە (٨٠٠) لێ لجزیرێ بدوسەد (٢٠٠) فلسي بو •

**پەنجي‌نار )**
ائیلەکە کوردە• مەزن وناڤدارە لناڤ خەرزا یە • (٧) حەفت بـــاڤکن • مالا ( چـــەتۆ ) مال‌مەزنێ پەنجي‌نـــارا بون • بشارێ چـــەتۆ ـ جـــەمیلێ چەتۆ دەنگ دانە ( بشـــار ) دشەرێ سالا ١٩١٤ دە ها دە ل ایران هاتە کوشـــتن • لێ ( جەمیل ) بدەســـتێ ترکا و دسالا ١٩٢٥ دە هاتـــــە بدارڤەکرن •

**( پەروەر )**
ئەڤیندارە • مللەت پـــەروەر • ئەڤینداری مللەتێ خوەیـــە • بدل وجان ژ مللەت و وەلاتێ خـــوە رە دخـــــەبتي • لێ ( پەروەر ) نەکوردي یـــە • هاتیە ناڤ زمانێ کوردی •
ع ـ ( المحب ) •

## ( پە ـ ش )

**( پەش )**
گلک جارا ل پەی ( رەش ) تێ گۆتـــن • دبێژن :ـ بەس رەش و پەشا ل مـــە چێ‌کە • ئەڤ چە رەش وپـــەشن ددي بەر مە ؟ ئـــــەم ژ ڤا رەش وپەشا ناترسن • ( ســـاویرە )
ع ـ الاشباح والعقبات ) •

**( پەشوش )**
ناڤێ مرۆڤەکي ژ گوندێ مـــە بو • نم بێ‌قدۆش بو • چەند ســـالا رەزەک داني لێ پاشێ رەزێ وی هشـــک بو و زێ نەخـــوار • ژنێ گونـــدیا ژ زارۆکێ خوەرە دستراندن و

دگۆتن :ـ
ئەز قوربانۆ پەشوشۆ !
رەزەك دانی ژ كەركوشۆ
تلي نەبو بدە موشۆ ...
پەشوش ـ خلوخاڤي ـ سست و خاف و گەوشەكە •
دبێژن :ـ بارام پەشوشي يە • یانی نە ستەپە ـ نەخورت وزيرە •

( پەژ )
زراف ـ گولي وكات وچلبي وترحێ دارانە • بچوكێ وێ ( پەژك ) تێ • ( هەژك و پەژك ) گلك جارا ل پەي هەڤ تێن • دبي ژ ( پيژك ) هاتبي • ( پەژالوك ) ژی تێ گۆتن • دبێژن :ـ ڤا پەژالوكا ژڤي داری بكە •
ع ـ ( أغصان الشجرة ) •

( پە ـ ڤ )

( پەڤ )
بداخوازا ( بهەڤ ) هاتیە • دبێژن :ـ وەرە ئەمێ تفنكێ خوە ( پەڤ ) بگوهەرن •
یانی ( بهەڤ ) بگۆرن •
ئەڤ هەردو پەڤەنەـ بهەڤەنە پەڤرە هاتن ـ بهەڤرە هەنن •
ع ـ ( المجموع ) مع بعضهم •

( پەیڤ )
چەند گۆتن پەیڤەكە •
ژمەرە بپەیڤە ـ ژمەرد قسەبكە ـ ژمەرە خەبەر بدە •
ع ـ ( الجملة ) •

( پەراڤ )
قراغە • پەراڤێ دەریا قراغێ دەریا نە •
ع ـ ( السواحل ) •

( پەرتاڤ )
رۆناهی‌یە • پەرتەوە •
ع ـ ( الضوء ) •

( پە ـ ن )

( پەتهۆڤن )
موسقارەكی ناڤدارە • ئەلمانی‌یە
ع ـ ( معروف ) •

( پەسن )
گۆتنێ خوەش وباشن كو مرۆڤ دكاری بێ مرۆڤەكي ،

تشتەکی بدي ناسکرن ـ بدي
خوياکرن • وەک :ـ بـــارام
مرۆڤـــەکی وەلات پاریز
وگەرناس وناڤدار وناندارە •
ع ـ ( الوصف والمدح ) •

**پەرەستن )**
حسکرنە • آگر پەرەست ـ
ئێ ژ آگـــــر حس‌دکی
خاچ‌پەرەست ـ خاچ‌حەبینە •
گول‌پـەرەســـت دل بژۆکێ
گولا یە :ـ
یار زانی گول پەرەســــــتم
بـاقێ گولا دا دەســــــتم
بادە ژدەست نەنوشـــــــیم
آە ! ما چما سەرمەستم ؟•••

**پەرچقاندن )**
دبێژن :ـ ئەزێ سەرێ دژمن
بپــــەرچقێنم ب‌پەلخێنم ـ
هورهوربکم •
ع ـ ( التحطیم ) •

**پەریشان )**
وەک پەرییـــا • دبێژن :ـ
رەوشـــێ گلک پەریشـــانە ـ
نەخوەشە ـ بێ‌قرامـــە ـ بێ
آبۆرە ـ بێ پەرگالە ـ ژهەڤ
کەتي یە :ـ
بەختی مە وەک دو بســـکێ
وێ پر رەش وپەریشـــــان
چـــاوا ددل خوەدیـــکم
دژمن دبـــەردە رازن ؟
:ـ لێ ئەگەر ( پەری ـ شان )
پەرچیم بي وێ چاخێ پەری ـ
جنی یە • ( شأن ) عربي یە •
وەکە پەری یایـــە • جزیری
دبێژی :ـ
( پەریشانم پەری شا ن! )
پەریشانا پێشی نەخوەش وبێ
پەرگالە • لێ پەری‌شانا داوی
وەک‌پەریا • دکۆکا خوە دە
پەریشانم ئەي پەری‌شـأن ! ـ
ئەی یارا وەک پەرییا !
ع ـ ( الضعیف ) المتحیر •

**( پەرلەمان )**
بەرلەمانە ـ جڤاتا ڤەبژارتي یە
ئەوروپي یە • بکوردی ئـەم
دکارن سێژن :ـ ( جڤینگە ) •
ع ـ ( المجلس النیابي ) •

**( پەرتاندن )**
وەکە پڕلاندنە • پەرتــاند ـ ژهەڤ پەرچەکر • شەوتاندنا زێدەیە ـ کەلاندنا زێدەیە •مە گۆشتێ خوە کەلاند هەتا کۆ پەرتي ـ ژهەڤ کەت • دناڤ آگردە پەرتي ـ شەوتي هەتـا کۆ ژهەڤ کەت •
ع ـ ( الهلاك ) •

**( پەرخاندن )**
ئەڤ پەتیخ پەرخي یە ـ ژچا خا خوە دەربـاس بویــــە ـ بهریـــــە ـ نما تێ خوارن ـ ژهــەڤ کــــەتي یە • کالێ پەرخي ـ ژهەڤ کەتێ بنـاڤ سـالادە چویە •

**( پەری‌خان )**
ناڤێ ژنایە ـ پەري‌خان آغاتیـا ایلا رەما کریە • ناڤــدارە • پەری ـ جن • خان ـ مەزن ـ سەرەك ـ پادشـاه ـ میرە • پەري‌خان ـ خانێ یا خانـــا پەري‌یا ـ مەزن و پادشـــاهـا پەری‌یا •
ع ـ ( ملكة الجان ) •

**( پەڤ‌چون )**
شەرە ـ چونەهەڤە • دبێژن:ـ بارام وفەرهاد پەڤ‌چـــون ـ چونە ـ هەڤ ـ شەر کرن •
ع ـ ( التقاتل والتعارك ) •

**( پەلیکان )**
ناڤێ قەلەمەکي یە •
ع ـ ( اسم نوع من الاقلام )

**( پەلشاندن )**
فەلشاندنە • ژهەڤ خـستنە • ژهەڤ جرانـــدنە ـ دیوار پەلشي ـ ژهەڤ کەت • مـن دیوار پەلشاند ـ من دیـــوار ژهەڤ خست ( الهدم ) •

**( پەلخاندن )**
پەرچقاندنە • دبێژن :ـ ئەزێ ســــەرێ دژمن بپەلخێنم ـ بپــەرچقێنم ـ پەرچــەپەرچــە بکم ـ هورهور بکم •
ع ـ ( التحطیم ) •

**( پەهین )**
یا پەهین • لێدانـا بپێیــە • دبێژن :ـ من پەهینـــەك ل دەرزکا پشتا بارام خست یانی

من ب پێ‌خوە ـ بلنگێ خوە
ل پشتا بارام خست .
ع ـ ( النرفەزة ) .

( پەیمان )
بەخت وباوەری یە ـ گرێبەند
وبەخت‌نامەیە .
ع ـ ( المواثیق والاحلاف ) .

## ( پە ـ ه )

( پەناه )
وا دیارە کۆ پشتە ـ فارسی‌یە
کورمانج دبێژن: ـ پشت وپەناه
ع ـ ( المسند ) .

( پەهلەو )
پەهلەوی کوردێ کەڤنارەنە
ژ پەهلەوان هاتیە ـ پالەو ـ
پالۆ پای‌تەختا دەرەبەگی یا
دوملی ـ زازا یە . ژ لەورا
پر درستە کۆ زاز ـ دومل ـ
دومبل پەهلەوی بن . زمانێ
وا ژی کوردیا کەڤنارە یە .
نێزیکی زمانێ هەورەمانی یە .
ع ـ ( اصل الشعب الکردی )

( پەرتەو )
پەرتاڤە ـ رۆناکە ـ روناهی
یە . پەرتەوپاشا هەکاری باپیرێ
دەنگبێژ و شاعر وهۆزانێ
کورد عبدالرحیم‌رحمی پەرتە وە
کۆ بەری چەند سالا ل‌شارێ
آستان‌بولێ کۆچا خوە بار کر
وپشتا خوە دا مە . دیوانەکە
وی بکورمانجی هەیە ل
آستان بۆلێ هاتیە چاپ کرن .
ع ـ ( الضیاء ) .

( پەی )
پشتە . بارام ل پەی فەرهادە
ـ ل پشت وی یە . ئەز ل
پەی مرۆڤێ نەزان ناچم ـ ل
پاش مرۆڤێ نەزان ناچم .
ل‌پەی مە وەرە ـ ل‌پاش مە
وەرە . ع ـ ( الخلف ) .

## ( پ ـ ت )

( پت )
شیرین وخوەشک ونازدار
وزارۆک . مێر تەنێ کاری
ژ مەڤلا خوە رە ـ ژ پیرەکا
خوە رە بێژی: ـ پتێ . لێ
نابی کۆ ژ یەکە دی رە ولۆ
بێژی . ژبەرکۆ پتێ شونا

( عزيزتي ) دزمانێ عربي ده دگري • يا ( صـــغيرتي ) • ئه‌گه‌ر مرۆڤه‌ك ژ ژنه‌كه دی ره ولۆ بێژی وێ بغه‌يدی • ع ـ ( عزيزتي ـ صغيرتي ) •

( پتپت )
قه‌لـه‌و ـ پــــه‌يف وگۆتنێ زێده‌نه • دبێژن :ـ چــــه پتپتا ته‌يه ؟ ياني چه گۆتنێ بێ داخوازن ؟
ع ـ ( التمتمـــة ) •

( پت )
ده‌قه • نقطه يه •

( پست )
وه‌كه ( پشت ) ژ بۆ به‌ردانـا بسيكێ يه • گۆتــه‌كه ده‌نگي يه • ع ـ ( كلمة صوتية ) •

( پست )
ده‌نگێ بدزی يـــــه • كورت وپسته • دبێژن :ـ چه كورت وپستا وه‌يه ؟ ياني چه گۆتنێ بدزي نه هون دكن ؟

( پست پست )
وه‌كه پست تێ گۆتن • چــه پست پستا وه‌يه ؟ ياني چــه په‌يڤێ بدزی‌نه ؟
ع ـ ( الهمس ) •

( پست )
ده‌نگێ گوله يــه • دبێژن :ـ گوله گۆ پست ـ پزت دبــه‌ر گوهێ مه ره چو •
ع ـ ( صوت الرصاص ) •

( پرت )
ده‌نگێ فراندنا ته‌يرايه‌ـ چوك وچقيكا يه • دبێژن :ـ چوك گۆ پرت وفريــا •
ع ـ ( كلمة صوتية ) •

( پرت )
قه‌له‌و • ده‌نگێ كۆ ژ داويــا مرۆڤ ـ جاندار ده‌ردكه‌ڤي • گۆپرت وبه‌ردا •

( پشت )
پاشه • ل پشت بارامـــه ـ ل پاش بارمه • ( پشـــت ) ئـه‌و تشتێ كۆ مرۆڤ ل پشتا خــوه دگـــه‌رێني ـ گرێـــدي •
( پشت ) ره‌خێ پاشي ژ هه‌ر

تشتي • پشتا بارام تێشي • ل پشتا چیێ بارام هاتکوشـــتن بارام ل پشت دیۆیرە •
ع ـ ( الظهر ) •

**( پشت )**
دەنگي یە ـ بەردانا پســـیکێ یە • پشتپشت •
ع ـ ( کلمة صوتیة ) •

**( پفت )**
ژ ( پفێ ) هاتیـە • دبێژن :ـ بارام گۆ پفت وآگر ڤەمراند • گۆتنەکە دەنگیيە •
ع ـ ( اطفأ السراج بفمه ) •

**( پڤت )**
وەکە (پرت ) گۆتنەکە دەنگي یـــە • ژ داویـــا جانـــدار دەردکـەڤي •
ع ـ ( کلمة صـــوتیـة ) •

**( پلێت )**
کاغزەکە نڤیساندیيە • دچونا سینەما دە ددن مرۆڤ دا کـۆ جهێ خوە ناس بکي رەڤـــە ما کورسي تێ دەیە •
ع ـ ( معروف ) •

## ( پ ـ س )

**( پس )**
وەکە پســــتە ـ بەردانـــا پسیکێیە • پسپس ••• یاني هرەهەرە ـ ولۆ مەکە •

**( پس )**
پشتە • پسمام ـ کورمام ـ ئێ کۆ ژ پشتا مامێ مرۆڤە • چاوا کۆ ( دۆتمام ) کەچ مامە •
ع ـ ( العمومة ) والقرابة من جانب العم •

**( پرس )**
گۆتنە ـ ( پرس ) پرســیاری یە • ژبارام بپرسە • ل چـە دپرسي ـ پرسا چەدکي ؟
ع ـ ( السؤال ) •

**( پریس )**
یان ( پریسك ) پیژێ آگرن کۆ دپژڤن • ( پریســـــك ) بچوکێ پریســـە •
ع ـ ( الشرارة ) •

**( پرەنس )**
ئەوروپي یە • تۆرنە • کوری

مرۆڤێ مەزنە •
ع ـ ( أولاد الملوك والامراء )

## ( پ - چ )

**( پچ )**
بداخوازا ( پچوک ) هاتیە •
پچک نان بدە من ـ هنک نان
بدە من • ( پچێ ) ناڤێ
ژنەکە کوردە • بچوکێ یە •
ع ـ ( الصغیر ) أو القطعة
الصغیرة •

**( پرچ )**
قژە ـ پورە • موێ کۆ ل
لاشێ جاندار شین دبن ـ
دەردکەڤن ع ـ ( اللبادة ) •

**( پرچ )**
قەلەو • دەرکەتن وآڤێتنە •
نگێ من کەتە ناڤ حەریێ
گۆ پرچ • برینێ گۆ پرچ
وڤەبو • پزکا م کۆ پرچ
وتەقیا •

**( پچپچ )**
ترش بونا زێدەیە • رموشێ
دبێژی :ـ هەڤیرێ م پچپچ
یە • یانی گلک ترش بویە •
نەپخیە • بلند بویە •
ع ـ ( نفخ الحموضة ) •

**( پلچ )**
وەکە ( پرچ ) دەنگي یە •
داخواز یەکە• تەقاندنا پزکي-
چراڤێ ـ برینێ یە •

## ( پ - ح )

**( پح )**
غەید ودلنەخوەش یا بێ
دەنگە • دبێژن :ـ بارام
غەیدیە پحپح ژێ تێ •
ع ـ ( الغضب ) •

**( پخ )**
( پخپخ ) دەنگێ دخەو دەیە •
بارام کەتیە خەوێ پخپخا وی
یە • ( صوت النائم ـ الشخیر)

## ( پ - د )

**( پرد )**
بسۆراني ( پرە ) •
ع ـ ( الجسر ) •

**( پند )**
کونە• تلیا من ل پندا وی ـ ل

کونا وی • ( تلي‌پنــدک ) ـ
ئیزه‌که زاروّکا یه • چـــاف
گرتیکا یه• چاڤێ یه‌کی دگرن
وتلیا خوه دپندا وی هلددن •
ودبێژن :ـ تلي‌پنـــــدک
بکوّراي دەستێ خــوه تاڤێژي
وان ودخوازي یــه‌کی بگری
وتێخي شونا خوه •
ع ـ ( الدبر ) •

( پز )
بلنده • بارام خــوه پزدکي ـ
خوه بلند دکي • تێ‌ده پایــه
هه‌یه • خوه پزدکي ـ خــوه
کبار دکي • پچــــوکێ وێ
( پزکه ) ژ کوینرێ پچـوک
تره • دبێژن :ـ پزک دلاشێ
مه ده هاتنــــه •
ع ـ ( القرحة ) •

( پرد )
ده‌نگێ ریتنێ یه • بارام گــوّ
پرر وبخوه‌ده ري• ده‌نگي‌یه
پرین ژێـده‌رێ وێ یـــه •
( پررک ) پچوکێ وێ یه •
( پررک ) گه‌مـــارا بن آف

ودمس وتشتێ روّن دکه‌ڤی •
پاشێ بویه ناڤێ ( به‌لاێ ) ئه‌ز
که‌تم پررکا وه ـ که‌تم بـــه‌لا
وه •

( پشته‌مێر )
پاش‌مێره • ئه‌و مێرێ کــــوّ
پشتا مروّڤ دکری •
ع ـ ( المســــند ) •

( پرد )
زوّره ـ گه‌له‌که • ده‌ما ئــه‌م
بسه‌رێ چیا که‌تن ئه‌م پــرر
بون ـ زوّربون ـ که‌لـــه‌ک
بون • ع ـ ( الكثرة ) •

( پر )
پرده • ع ـ ( الجسر ) •

## ( پ ـ ش )

( پش )
آردێ گه‌له‌ک هوره • آردێ
پاش آشه •
ع ـ ( الطحين الرقيق ) •

( پش‌پش )
داگرتنا بێ‌ده‌وساندنه •
سێنی‌یه‌ک آرد پش‌پشـــاند و
دا من ـ نه‌ده وساند • هێدی

بسەرهەڤدە • بەردا ونەدەوساند •

( پژ )
وەكە ( پرر ) دەنگێ ریتن ـ ریختنە •

( پش )
وەكە پشتە • ژ بۆ بەردانا پسیكێ یە • پشت ـ پش • یانی ولۆ مەكە • یا هەرە یا دوري هەرە •••

## ( پ ـ ف )

( پف )
بایێ دەڤە • پفكە ایگر • پفكە چرایێ ـ پفكە گرارێ •
ع ـ ( الاطفاء بالفم ) •

( پڤ )
دەنگێ ترێ یە ـ دەنگێ مێشي‌یە • دەنگێ گولە یە •
ع ـ ( صوت الذباب ) •

( پشكۆڤ )
گولێ نەپشكڤی ـ یا نو پشكڤی‌نە •
ع ـ ( اكمام ) •

( پرق )
دەنگێ كەنە • بارام گۆ پرق و كەنیا • بو پرقپرقا كەنێ وی • ع ـ ( القهقهة ) •

( پك )
دلیزا ( كابا ) دە • پك ئەوە كۆ كاب ل سەر زك بكەڤي • ( ••• )

( پرك )
ئەو گەمارا بن دمسێ ـ بن آڤا ترى پشتی كەلاندني دكەڤي نافێ وێ ( بركە ) •
ع ـ ( ما يتبقى في الكوب من الوسخ ) •

( پشك )
بەشە ـ پارە ـ پایە • پشكا من باشە • پشكا تە نەباشە •
ع ـ ( الحصة ) •

( پژك )
ڤژك ـ فرك • ناڤچونە • گایێ مە پژكێ تاڤێژی ـ فرزكێ داڤێژی ـ فركێ تاڤێژی • ناڤا وی دچي •
ع ـ ( الاسهال ) •

( پلنگ )
بەربەرێ شێره •
ع ـ ( الفهد ) •

( پسیك )
پشیك ـ كتك • پسیكا مـن
خوەشكه • پشۆپشۆ !
ع ـ ( القطة ـ الهرة ) •

( پشكۆك )
ل دارا دكەڤن • زارۆك پێ
دلیزن • پچوك و گلۆڤەرن •
وهـارەنگه قوڤچـه نه •
پشكوكێ خوه ڤەكه ـ قومچێ
خوه ڤەكه •
ع ـ ( الزراری ) •

## ( پ ـ ل )

( پل )
ل پەي ( شـل ) تێ گۆتن •
دبێژن :ـ ( شل‌وپل ) ـ باران
شـــل‌وپله • وەكـــه : ـ
( هورومور )ـ ( تروڤر •••
ع ـ ( تأكید لما قبله ) •

( پشكول )
پشكولێ غزالا ، پشـــكولێ
بزنا ••• ژ ئێ كـەرا رە تێ
گۆتن :ـ ( سـەركول ) ئـەو
ریخـا كۆ ژ وان گلۆڤـــەر
دەردكەڤي •
ع ـ ( البعرور ) •

( پشكۆل )
گولكا كومێ سۆره •

( پشتكول )
ئێ كۆ پشتا وی كوله• نكاری
خوه بدی بن بارا • ئێ كـو
نـاخـــوازی خـوه بدی
بەركارەكي • من دخوەسـت
زۆرۆ بـمـــەرە بێ لێ گلك
پشتكولي‌یا دكي ـ خوه نادی
بەر هاتنێ‌ـ ناخوازی بـمـەرە
بێ • ع ـ ( التهرب ) •

( پیال )
پیانـه • ( پەیـــال ) ژی تێ
گۆتن • ع ـ ( القدح ) •

## ( پ ـ م )

( پسمام )
كورمامه ـ آموزایه • ژبـۆ
مێراتێ گـــۆتن • دوتمام ـ
آمۆزایه • ژبۆ ژنا تێ گۆتن•
هەتا هەزار باڤي كۆ هـــەڤ

ناس بكن پســـمام ودوتمامن • گلك جارا ژ مرۆڤێ بێ گانــه ره ژي دبێژن :ـ پســـمام • مرۆڤه‌ك هاتیه گوند بارام ژێ دپرسي :ـ ئه‌رێ ! پســـمام تو ژ كوفه تێ ؟ •••

ع ـ ( ابناء العمومة ) •

## ( پ ـ ن )

( پن )

له‌مه • پنێ شه‌به‌شا ـ لـــه‌مێ شه‌به‌شـــا یه • بـــه‌ر في پني خوه‌ش بكه ـ به‌ر في لـــه‌مي خوه‌ش بكه •

ع ـ ( حشائش البطيخ ومـــا شاكله ) •

( پتن )

ناڤێ گۆنده‌كي یه • ل زێرێ ( قامشلۆ ) دكه‌ڤي •

ع ـ ( قرية ) •

( پتون )

ناڤێ ژنه‌كه ئێزیدی یـــــه • ل(قامشلۆ) ناڤداره • دكیماسیا خوه‌ده ده‌نگ دایه •

ع ـ (اسم أمرأة) •

( پزان )

مال كارا بزنێ یه ـ مال زارۆكا جاندارا كۆ دزێ • هێ ڤــێ بزنێ پزانا خوه ناڤێتیه •

ع ـ (رحم الامهات) •

( پرسكرن )

زێده‌رێ تێ‌پـــه‌ره • (پرس) زێده‌رێ تێ‌نه‌په‌ره • :ـ پرسا دلێ من ناكي هـي دل گـــاورێ ! وه‌ي مـــال خراب ! •••

ع ـ (السؤال) •

( پركرن )

زێده‌كرنه • زۆركردنـــه • بسۆراني ـ داگرتنه • ڤــێ پیانێ پر بكه ـ داگره ـ تـژه بكه •

ع ـ ( الزيادة او الازدياد )•

( پشافتن )

حه‌لاندنه • هه‌ڤیرترشێ خـوه دناڤ ده ب (پشێڤه) هوربكه‌ـ ب (حه‌لێنه) •

ع ـ (الزوبان) •

( پشكافتن )
فەكرنا تشتەكي دروتي يــە • دۆشەكا خوە بپشكڤێ تــە • فەكە ـ تاپێ وێ فەكە •
ع ـ (الفتق) •

( پشكفتن )
ڤەبونا گول وپەل وكوليلكـــا يە • گول پشكڤين بەل بون ـ ڤەبون • دار پشڤكين ـ بـەل بون ـ ڤـەبون • :ـ پشكفتي صيفەت غونچــــە ژ چـــارا (ئەرەشي) • •• شعرا مەلايێ جزيری يە •
ع ـ (التفتق) •

( پژاندن )
كەلاندنە • گۆشتێ مە نەپژيا يە ـ نەكەليايە • بەرە قەنــج بپژی ـ بەرە باش بـكەلي • بارام هێ نەپژيا يە ـ هـــێ نەگهايە ـ هێ دسەرپێهاتيـێ دنياتێ دە نەهاتيە پژاندن •
ع ـ (الهريسة) •

( پژلاندن )
پەرچەكرنە• م گولاك بەردا كەفر زهەف پژلاند •پەرچـە پرچە كر • زهەف بەلاكر •
ع ـ (الانفجار) (أو التفجير)

( پژقاندن )
چەنگ كرنا آڤي يــە • بارام آڤ پژقاندە سەر چاڤێ فەرهاد چەنگ كرە سەر چاڤێ وی •
ع ـ ( كب الماء ) •

( پرتكاندن )
روتكرنا تەير وميريشكا يــە مريشكا خوە پرتكاند ـ پرتكێ وێ ژێ كرن •تەير پرتكاند• پرتـكێ وی ژێ كـــرن ـ روتكر •
ع ـ (قص الرياش) •

( پشتشكاندن )
ئەوە كــۆ پشـــتا يەكـــي بشكێني • لێ دەما مرۆڤەكـي باش ژ مالەكێ ـ ژاێلە كـــێ تێ كوشن مێركوژ دبێژی من پشتا فلان كەس شكاند • ياني من ئەو بێ پشت مێر هشت • هەروەكۆ پشتا وی بشكێ •
ع ـ (كسر الظهر) •

( پرقين )
انفجار من الضحك •

( پرۆپۆغان ) الدعاية •

( پشتۆ )
شەش‌آگره ـ دومانچەیه •
ع ـ (المسدس) •

## ( پ ـ ي )

( پتي )
ناڤێ مرۆڤەكي • ژبچوك
هاتيه • ع ـ (اسم رجل) •

( پرتي )
ژ پەرتال هاتيه :ـ بێ پرتي و
پەرتالن د شعرەكه مـن ده
هاتيه :ـ ( دين دان بپرني )
دشعرەكه سەيدايێ لجـي ده
هاتيه • ئەرێ رەوشێ ! هونێ
هـەرن بازێر چـه بكرن ؟
دبەرسڤا وى ده رەوشـێ
دبێژی :ـ ئەمێ ژخوەره هـن
پرتي بكرن •
ع ـ (البضائع) •

( پزی )
مالدۆخينه • جهێ دۆخينێ
يه • پـزىيا شالێ گەرناس
چۆخێ سۆره • قماشێ زەره
پزی يا شـەروالێ شـێركۆ
قماشێ سۆره •

( پلدی )
ناڤەكي بێ داخوازه • ژهـن
مرۆڤێ پيسك ره تێ گۆتن •
رەشكێ شەڤێـيه • زارۆك
چەرمێ پەز لخوه دكـن
وزەنگل وخشخشكا بخوەڤه
دكن وهەڤالێ خوه دترسێنن •
ژڤي مرۆڤي ره دبێـژن :ـ
(پلدی) •
ع ـ (الشبح المتنكر) •

## ( پ ـ ئۆ )

( پخكۆ )
گەرناسێ سەرپێهاتي يەكـه
قەشمەرىيه • گۆچەر چيرۆكا
پخـكۆ و پيرێ ) دبێژن :ـ •

( پدۆ )
گۆشتێ بەر درانا يه • گلك
دبێژن :ـ (پدو) پدوێ درانێ
بارام تێشن ـ گۆشتێ درانـێ
وي تێشن •

ع ـ (اللحم المحيط بالاسنان)• او (اللثغر) •

## ( پۆ ـ آ )

( پۆلا )

پولاد فولازه • مالا ( جان پۆلاد) ـ جان بلاط مالباتەکە نافداره • چەند سەداکي لکوردستانا رازرێ ( حلب ) فەرمانداری کرنه •سەرپێهاتي وداباشا وان دتاریخا شەرەفخان دە دور ودرێژ هاتیه نفیسین • ایرۆ ئەڤ مالبات درزینە لچیایێ (لبنان) رونشتینه •
ع ـ (الفولاذ) •

( پۆسته )

بەریدە • برید کوردییه لێ پوستە ئەوروپییە • (بەرید) ژ بردن ـ برن هاتیه یان (برێدە) هاتیه • یا ژ (بەریدەن) بردن هاتیه • چە کوردی وچە فارسي هەرنە عربییه •
ع ـ (البريد) •

( پۆستەخانه )

خانییێ پوستەیە • خانا پوستەیە • آڤانییا پۆستەیە •
ع ـ (مركز البريد) •

( پۆلیسخانه )

خانییێ پۆلیسە • جهێ پۆلیسە •
ع ـ (مركز البۆليس) •

( پۆدەره )

ئەوروپییە • تۆزەکە سپییە ژن بزارۆکێ خوە دادکن • چاوا کۆ ل پاش کورکرنێ بەربەر دروێ مرۆڤ ددن•بێن خوەش وبرینا زوا دکي •
ع ـ (البودەره) •

## ( پۆ ـ ئێ )

( پۆلێ )

نافێ مرۆڤەکییە • ژ(پۆل) هاتیه یا ژپۆلا هاتیه • محمدێ پۆلێ کورێ وی بو هات کوشتن •
ع ـ (اسم رجل) •

## ( پۆ ـ ت )

( پۆت )
کنجکێ کەڤن وپینە وپەرچەنە بچوکێ وی پۆتکە •
ع ـ (الخرق البالية) •

( پۆست )
چەرمە • بکـەمارێ هشک دکن ودبن خوەدە رادخن • (پۆست نشین) ئەو تۆبەدارێ کۆ رۆژوشەڤ سەرێ‌خوە ژ پۆست راناکي • هەر نمێـــژ دکي ونافێ خوەدێ دبیرا خوە تینی •
ع ـ (العابد الناسك) •

( پۆرت )
پەسنێ بدەرەوە •زۆرۆ گلک پورتێ خوەددي ـ زرتێ خوە دکي ـ پەسنێ خـــوە ددي • زێدە بدەرەوە پەسنێ خـــوە ددی •
ع ـ (المبالغة في المدح) •

( پۆتپۆت )
پتپتە • گۆتنێ زێدە کـــۆ نایینە ناسکرن نایینە زانین ـ بێ داخوازن •
ع ـ (الكلام الفارغ) •

( پۆلپەرست )
ستوخوارێ پۆلە ـ ئەڤنیدارێ پۆلە • دلبژۆکێ پۆلە •
ع ـ ( عابد الدرهم ) •

## ( پۆ ـ ر )

( پۆر )
قژە ـ گژکە • بارام پـۆرێ وي سپي بویە • پۆرێ سەرێ تە کوربي • لم پۆر کورێ ! (پۆر) ژ(پرچ) درێژترە •
ع ـ (الشعر) •

( پۆر )
نافێ چڤیکە کێ یە • ژبەرکۆ دسەرێ وێ‌دە مو ـ پۆر هەیە ژلەورا ژێرە دبێـــژن :ـ (پۆر) •
ع ـ (اسم طير) •

( پۆر )
بداخوازا بۆرە • (پورسعید) بۆرسـعیدە • بۆر وپۆر جهێ کۆ دآڤێ رە دەرباس دبن • چا وا کۆ (بور) بداخــــوازا

(بەیار) ژی هاتیە •
ع ـ ( المعبر ) •

پۆکەر )
نافێ لیزەکــە کاغزایــە •
ئەوروپێ یــە • بقمار دلیزن
ێ نزانم چاوایە •
ع ـ (لعبة ورقية) •

## ( پۆ ـ ز )

پۆز )
بێقل ـ کــەپو ـ لوتــە :ـ
پۆزبەرانۆ ! دەلــێدە •••
ئەزێ پۆزێ دژمن بپەلخێنم
لوتێ دژمن •
ع ـ (الانف) •

## ( پۆ ـ ش )

پۆش )
بەرانێ پوشەک ـ ئێ کــۆ
پوشا ل خەلکێ دخي گایــێ
پوشەک وەکــە بەرانــێ
پوشەکە • پوش لێخستنــا
بسەری‌یە •
ع ـ (النطح) •

( پۆش )
سەرپۆش ـ داپۆش • پۆشین
نخــوماندنا ســەري‌یە •
سەرپۆش بخوە داکري‌یە ـ
خوە نخوماندیە • روێ خــوە
ڤەشاردي‌یە • (پۆشي) یــا
بۆشي • نافــێ دەسمالەکی ـ
ئەپری‌یەکي یە • بســەر
سەرێ خوە دادکن • یــا
لسەرێ خوە گرێددن •
ع ـ (الغطاء) •

## ( پۆ ـ ڤ )

( پۆڤ )
پورە ـ قژە • آشیتا ولــۆ
دبێژن • پۆڤێ رەوشێ وەکــە
پۆڤێ دینا یە •
ع ـ ( الشعر في لهجة ) •

## ( پو ـ ل )

( پۆل )
کێمێ پەرایە • (پۆلپەرست)
مرۆڤێ کۆ گەلەک ژپۆل رە
ستوخواری‌یی دکی دلبژۆکێ
پۆلە ـ عابد الدراهم •
ع ـ (الفلوس) •

( پۆل )
داويا ملە • دسەوالادە داويا نگێ پێشيیە ئەو هەستيیێ پانە كۆ دژۆرێ لنگێ سەوالا ئێ پێشي دەیە • لێ دمرۆڤا دە دژۆرێ (مل) دەیە • :ـ هن دبێژن :ـ (پيل) •
ع ـ (لوح الكتف) •

( پۆل )
كاغزكێ بچوكە درەنگێ پەرادە یە • لسەر ناما دخن وبپوستە دنێرن • لعرضیحالا دخن • دبي ژپۆلێ كەڤارە كۆ بداخوازا پەرەیە هاتبي • ژبەركۆ پولێ بداخوازا پەرە كێمێ پەرایە • بچوكێ ( پۆل ) پۆلكە •
ع ـ (الطابع) •

( پۆلپۆل )
پەیڤا زێدە وبگلي وگازنە • رەوشێ حەتا ئێڤارێ بسرمە دە دكي پۆلپۆل • چە پۆلپۆلا تەیە بسەر مە دە ؟
ع ـ (التشكی مع الحزن) •

## ( پۆ ـ ن )

( پۆتین )
قەرە گزمە ـ جەزمە • ئێ دبي (پۆتین) ژ جەزمێ كنتربي • زبەركۆ دو نقش پۆتین هەنە :ـ نقشەك دەڤێ وێ ـ ساقا وێ كنە • ونقشەك ساقا وێ درێژە دگهێ بەر چوكێ • ژ آ پاشي رە دبێژن :ـ قەرە گزمە ـ جەزمە • لێ ژ آ پێشێ رە تێ گۆتن :ـ پۆتین • لێ بتەڤايي ژ هەموارە (پۆتین) تێ گۆتن•
ع ـ (الجزمة) •

( پۆخین )
گرارا جهینيیە • جەهـ دبرێژن و دهێرن و دكەلینن دبي (پۆخین) • لێ ژێدەرێ ڤێ گۆتنێ دكوردي دە خویا ناكي • نزانم ژ كو هاتیە •
ع ـ (مطبوخ من الشعیر) •

( پۆشان )
داپۆشان نخوماندنە • سۆرانيیە • ژ فارسي هاتیە•

ع ـ (الغطاء) •

**پۆشمان )**
دژمن کۆرپۆشمان ڤەگەریا •
دخوەست کۆ ئەڤ نەکرا •
پۆشمان بویە • دبێـــزی :ـ
خوەزی من ولۆ نەکرا !
ع ـ (ندمان) •

**پۆژن )**
یا(پوژن) • ئەوە کۆ مرۆڤەک
بـسەر خوەدە دپۆژنـــــی ـ
غەمگیر دبي دکـــــەڤی ناڤ
ساویر وگـــۆمانا ـ بـــێماد
ودلنەخوەشە • :ـ مادێ بارام
نەخوەشە ، بـسەر خـــوە دە
دپوژني نزانم چە پێ هاتیـــە؟
ع ـ (الحزن والاسی) •

**پۆشکین )**
یا (پوشکین) ناڤێ شـاعرەکي نا
ڤدارە روسي‌یە • هۆزانەکـــي
مەزنە •
ع ـ (شاعر روسی) •

**پۆغان )**
کوچ وکۆلان • دبي ژترکي
هاتبي • برۆپۆغان ـ دعایتە •

ع ـ (الازقة) •

## ( پو ـ ئۆ )

**( پوشۆ )**
ناڤێ مرۆڤەکي‌یە • کـــورێ
سید طاها ناڤێ وی پۆشۆ بو •
ع ـ (اسم رجل) •

## ( پو ـ ئێ )

**( پونێ )**
چیرۆکـــا (مالاپونـــێ) دناڤ
کورمانجـــــا دە ناڤدارە •
دبێژن : (٧) حەفـــت کورێ
پونێ هـــەبون باشـــێ وا
قوندەبو •
ع ـ (اسم عائلة) •

## ( پو ـ ئي )

**( پورتي )**
ناڤێ مالباتەکێ‌یە •
ع ـ (اسم عائلة) •

**( پوشي )**
ژپاچک ودارا ـ گەیا چـــێ
دکرن • پێ آگرێ خـــوە
بکەڤر و هەستا ڤێدخستن •
داتانین سەر بەستەم وهەستە
ل بەستەم دخستن آگــــــر

ژكەفرێ بەستەم دگها پوشـي وڤێدكەت •

ع ـ (خرقة بالية تستعمـل لاشتعال النار بالزند) •

## ( پو ـ ت )

**( پـوت )**

(پوتولات) ناڤێ دو سنەمـا يە • پوت پەرەس ئێ كـۆ ژپوتا رە ستوخوارى دكـر • هن دبێژن :ـ (پەت) يـان (پت) آ پاشي بداخوازا شێرين وجوان ودەلاله • مێر ژ ژنـا خوەرە دبێژى :ـ (پتێ) يانـى شێرينێ ـ عزيزێ ـ معبودێ ـ بچوكێ •••

ع (اللات والعزا) معبود قديم•

**( پوخت )**

ژپاتن ـ پەحتن • هاتي يـە • ياهەردو ژ(پوختن) هاتنە •

ع ـ (الطبخ الجيد) •

**( پورت )**

ژ(پرچێ) هورترە • كورمانج دبێژن :ـ ( نـەمێرى ) روت ونەژنا بپورت • ئەزێ بكـم پورتا سەرێ تە بوەشـي • ئەڤ چەرمێ تە پورت پێ ڤـە نەمايە •

ع ـ (الشعر الخفيف) •

**( پوشت )**

قەحبە • لێ دبي ژ تركـي هاتبي ناڤ زمانێ كوردى •

ع ـ (الفاجرة) •

## ( پو ـ س )

**( پوليس )**

ژاندرمە نە • ئەورووپي يـە • لێ هاتيە رۆژهلات • كـورد وعرب وترك و فارس هەمو دبێژن :ـ (پوليس) •

ع ـ (البوليس) •

## ( پو ـ چ )

**( پوچ )**

بێ ناڤكە • ئەڤ گەنم پوچە ـ بێ نشايە ئەڤ گويز پوچـە • بێ ناڤكە • دلاش دە دەستێ بارام پوچە ـ بێ نەڤگـەر وهێزە •

ع ـ (الشلل) •

## ( پو ـ ز )

( پـوز )
دەنگەكی بچوك وزراڤـــه ژداویا مرۆڤا دەر دكەڤي •
ع ـ (كلمة صوتية) •

## ( پو ـ ش )

( پوش )
ئەو گەیایێ هشك وزوایه • پوش پەلاخ • پوشێ پەلخـي یە ـ پوشێ شكەســـتي یە • دبێژن :ــ بارام پالێ پوشه • یانی خـــەباتا وی بێكاره ـ بێفێدەیە • تشتەك بدەستێ وی ناكەڤي •
ع ـ (الهشيم) •

## ( پو ـ ك )

( پوك )
سەرما زێدەیە • تو دبێ ڤەی پۆك لێ دباري • ایرۆ پوك دباري • بەرفەكە بێآڤـــــه گلك سار وسەرما تــــێ دە هەیە • رۆژا كۆ بەرفا پوك دباري گلك سار وسەرمایە •
( نوع من السلج ) •

( پوچك )
بچوكـــێ پوچـــه • دەرباس بویە •

( پوشك )
بچوكێ پوشـــــه • دەرباس بویە •

( پولك )
بچوكـــێ پولـــه • دەرباس بویە •

## ( پو ـ ل )

( پـول )
پۆلـــه • دەرباس بویـــە • هنددبێژن :ــ پۆل • وهـــــن دبێژن :ــ (پول) • وهـــــن دبێژن :ــ (پیل) •

( پونك )
گەیاكي بێنخوەش وبتامـــە دخن ناڤ خوارنـــێ • (مار) گلك ژ پونگـــــێ درەڤي • دبێژن :ــ مار ژ پونگێ درەڤي پونگ دبەر قولا وی دە شین تێ •
ع ـ (النعنع) •

## ( پێ ـ آ )

( پێشيوا )
ائزيدى دبێژن :ـ پێشيمام •
ئێ كۆ ددى پێشيا مللەتەكي•
ع ـ (زعيم) •

( پێشيا )
ئەوێ كۆ بەرى مە هاتــــە
جهان ورابۆرنيــە ـ دەرباس
بونە • دبێژن :ـ پێشيا ولـۆ
گۆتيە • پێشيا گۆتيە :ـ رى
دبێ بۆســـت • دژمن نابي
دۆست • پێشيا گۆتيە :ـ كـۆ
دۆ دەستێ خوە بدن هــەڤ
ئێ ســيا خوەدێيە • پێشـــيا
گۆتيە :ـ كەس بخوەزيـــا
ناگرى باقێ كەزيا • پێشـــيا
گۆتيە :ـ دەستێ ترسونەكـــا
سينگا سبي نابێني •
ع ـ (القدماء) •

## ( پێ ـ ئي )

( پێتي )
ژ(پێت) هاتيە • آلاڤ وپێت •
رەمي ورۆڤيا أێگرن •
:ـ پێتي‌يێ آرێ نەڤينا تە يــە
ئەز كرمە پەرەنگ •
ع ـ (اللظى) •

( پێشي )
كەلمێشن • پێشيا ئەم خوارن
هن دبێژن :ـ (پێشو) هـــن
مێشێ هور وژەهــــرى‌نە •
نەخوەشي‌يا (تا) بپێشي‌يا تـێ
گوهەزتن هەر چقا شەرێ وا
دكن لێ نكارن داويا وا بێنن•
(دى‌دى‌ـ‌تێ) دەرمانێ وا يە •

## ( پێ ـ ت )

( پێت )
آلاڤ ورەميا آگرە • دەرباس
بويە • ( پێتي ) ژپێت هاتيە •
مە ددل پێت وبروسكن •
ع ـ (قد مر) •

( پێروت )
مرۆڤێ بێدەرپـــێ يـــە •
وهارەنـــگە ژمرۆڤێ بێمـال
رەتێ گۆتن :ـ ئەزقربـانۆ !
پێي روتۆ ! زڤستانى زەلوتـۆ
دهاڤينێ بێقوتۆ •
ع ـ (الصعلوك) •

( پێـچ )
بچوکێ وی پێچەکە • ئـەو
تشتێ کۆ لسەرێ خـــوە
دپێچن • یا لزاروکا دپێچـن
پێچەکا شێرین فەبویە • پێچا
خوە گرێدە • شاشا خـــوە
گرێدە - چارا خوە گرێدە •
پەردا خوە گرێدە • ژن جارنا
بەرددن سەر چافێ خـــوە -
سەر رودێمێ خوە •
ع - (المیزر) •

( پێز )
سەر زێرێ (پەزە) • ئەزچومە
ناف پەز - چومە ناف (پێـز
(هەفیرکا) ولۆ دبێژن •
ع - (محرف من (پەز) بمعنی
الاغنام) •

( پێـر )
رۆژا بەری دۆهـــە :- ایرۆ
- دۆهـ - پێـــر پترپێـر •
پار - پێرار - پتر پێرار •
ع - (قبل الامس) •

( پێسیر )
سینگە • یا فەکـــرنا کراس
وقطکە وایلەکە • یـا ئـــەو
کنجێ کۆ لســەر سینگا وی
نە • پیسیرا کراس فەکرنـــا
سەر سینگێ کۆ پشکۆژا لـێ
دخن • پێسیرا کراسێ رەوشێ
گلک فرەیە • بارام دروژێ
پێسیرتەنگی‌دە بکێر تێ •
ع - ( الفتحة في الثوب مـن
جهة الصدر) •

( پێسور )
زەنجیری چیانـــە • دبي ژ
(پەسار) هاتبي •
ع - (سلسلة من الجبال) •

( پێخیر )
وەکە پیسێرە • لـــێ (پێخیر)
نیشانا نەتەکوزی‌یە • ژهـەڤ
کەتی‌یـــە - بێپـــەرگالە •
دبێژن :- لپێخـــیرێ وی
بنەرە • جاوانە •
ع - ( غیر منظم ) •

( پێرار )
سالا بەری پارە :- ایسـال -
پار پێرار • پترپێرار •
ع - (السنة التی مضت قبـــل

السنة الماضية) •

( پێکر )
ئەو مرۆڤێ کۆ کارەکـــي ـ تشتەکی بیەکی دی دکي • تە آ خوە پێکر • (کرۆک) •
ع ـ (الفاعل) •

( پێکەر )
پێکراوە • ع ـ ( مفعول ) •

## ( پێ ـ ش )

( پێش )
دهـــەمبەر ( پاش ) دە تێ • بـــەرێ مرۆڤ لکوبي ئـــەو دەر پێشـــە تا داوی ـ هنگي هەري ع ـ ( الامام ) •

( پێش )
لپێ ( ایْش ) تێ • دبێژن :ـ ایْش و پێش دەڤ ژ مـــــە بەرنادن • ئەڤ چـــە ایْش وپێشن ؟
ع ـ ( الامراض ) •

( پێش )
نشاندان وئەشـــکراکرنە • دبێژن :ـ ئێ کۆ قەبول ناکي بەرە خـوە بدي پێش • یانی بەرە خوە ئەشکرا بکي •
ع ـ ( الأظهار ) •

( پێشکێش )
دیاری ویادگارە • ئـــەز فێ نفشتێ پێشکێشـــــي مللەتێ کورد دکم • یانی بدیـــاری ویادگاری ددم مللەتێ کورد •
دکێشمپێش مللەتێ کورد •
ع ـ ( التقدیم والهدیة ) •

## ( پێ ـ ڤ )

( پێچاڤ )
( ئەني ) یە ـ ســــەرچاڤە • دبێژن :ـ من دپێچـاڤێ باراە دە لێخست • یانی من ل ئەني یا وی خســـت •
ع ـ ( الجبهة ) •

( پێگاڤ )
هنگاوە • دبێژن :ـ پێگاڤا تـە بڤر ناکەڤي ـ یانی نابێ تــۆ گاڤەک ـ هنگاوەکي بـــەر بمالا مە دە باڤێژی •
ع ـ ( الخطوة ) •

( پێلاڤ )
نافێ هەمو تشــتێ كۆ مرۆڤ
دخي نگێ خـــوە يانی :ـ
قوندەرە ـ شەكال ـ شمك ـ
... دبي ژ ( پێل‌نــــاف )
هاتبي . ژبۆ ســـڤكي ( ن )
رابويە . ع ـ ( الخفة ) .

## ( پێ ـ ك )

( پێپەلوك )
پێ پێ لۆكە ـ نەردەوانە . يا
ئەو كەڤرێن كۆ مرۆڤ دناف
آڤا دە ـ دناڤ چەما دە پێ لێ
دكي ودەربـــــاس دبي ـ تێ
دبەری. پاشێ بويە نافێ هەمي
تشتێ كۆ موروڤ بيـــا تێ‌دە
دەربـــــــاس دبي . وەك
نێردەوان ـ دەرجە ـ دەرەنجە
ع ـ ( الاحجار التي وضـعت
بين النهر للعبور عليها ) .

( پێچەك )
بچوكێ ( پێچــە ) ژ ( پاچ )
يا ژ پێچان هاتيە . ئـــــەو
پاچكێ كۆ ژن زارۆكێ خوە
تێ دە دپێچـــن . لێ پێچ ـ
گرێدانا سەری یە . ژبـــۆ
مێرا دبێژن :ـ شـــاش‌پێچ ـ
شاش‌پیچان . :ـ شاش‌پێچانـا
خوە گرێـــدا رەش رەیحان
دابون بەرە .
ع ـ ( ما يلف به الطفل ) .

( پێشك )
ئەوێ كـــۆ ل‌پێش دچي ـ
پێشـنگە ـ پێشــــكەتە .
دبێژن :ـ پێشكێ نادم كەسي.
يانی تم دخوازم نــەز دپێش
دەبم .

( پێشنگ )
وەكە پێشكە ـ پێشـــي يە .
دبێژن :ـ وێ ل پێشــــنگي
آڤ وجەری . گوندۆ بـــەر
خۆپانۆ بێری ...
ع ـ ( كلاهما بمعنى المقدمة )

( پێشك )
نفشەك درونە . بتا دورەخێ
جاو دگهێنن هەف وناڤ‌بەرا
وادە پێشكە . دروتنەكـــــە
ب‌نەخشـــە . ژن ڤێ دروتنێ
باش دزانن .

ێ ـ ( نوع من نقوش الخياطة )

( پێك )

تـــەكـــوزە • دبێژن :ـ هێ ایشێ مە پێک نەهاتیە • یانی هێ تـــەكوز نەبویـــــە • پێکهاتیە ـ تەکوز بویە •

ع ـ ( التحضير ) •

## ( پێ ـ ل )

( پێل )

دآڤێ دە ـ لافاو ـ شەپولە • درادیۆدە پێلا کورت ـ پێــلا درێژ •••

ع ـ ( الامواج ـ الموج ) •

( پێل )

دەمە ـ جاخە ـ ظەرفـــــە • دبێژن :ـ هەرە پێلا کـــە دي وەرە • ڤا رۆژا پێل راوەستیا یە • پێلاکێ زۆرۆ ژي آغـــا بو • ڤێ پێلێ نەخوەشە •

ع ـ ( الظرف ـ الظروف ) •

( پێش مال )

جاوەکە • ژن ددن بەر خوە•

( پێ ـ م )

( پێشي‌مام )

پێش مام • یا پێش ایمامـــە - مامێ کۆ ددي‌پێش • یـ ایمـ ـي کۆ دکەڤی پێش ایزیدي تەـي ولۆ دبێژن •

ع ـ ( العمدة ) •

( پێغام )

یا پەیغام • پیامە • مز گینـــــە ددیوانێ کوردی دە هاتیە •

ع ـ ( الالهام والرسالة ) •

( پێشەم )

پێنج شەڤە ـ پێنج شـــــەوە شەڤا پێنجەمینە ـ شەڤا پێنجـ یە • کورد وفارسی بـشـەڤـ دژمێرن •

ع ـ ( الخميس ) •

## ( پێ ـ ن )

( پێچان )

بپێچە ـ لێ‌بگەرێنە• رەوشێ زارۆکـــا خوە دپێچي • یاني پاچکا لێ دگەرێن بارام شاشکێ خوە دپێچي ـ ل سەری خوە دگەرێني • ع ( اللف ) •

( پێژن )
ئەز پێژنا تشـــــتەکی دکم •
پێژنک هاتـــە گوهێ من •
بێپێژن ئەز هاتم • ئـــەز لێ
پێژنیم • بپێژنە •
ع - ( الحس والشعور ) •

( پێزان )
ئەو مرۆڤێ کۆ بهـەر تشتي
دزانی • پێزانە - رێزانـە -
بیرەوەرە :- زیرەکە •
ع - ( العراف ) •

( پێگان )
نەخوەشـــــي ودەرد وکول
وآزاری یە • دبي ژفارســــي
هاتبي • ددیوانا جزیـری دە
هاتیە •

( پێوان )
ئەوێ ل تشتەکی پێوانی دکن
- شیاری دکن - لبەر شـیار
دمێنن • ع - ( الحراس ) •

## ( پي - ئي )

( پي )
لنگە • ( پي ) ملە • ئـەم بێ
دەست وپي مانە • بێ دەسـت
ولنگ • من بپێ وي گرت
- من بملێ وي گرت • دبي
ژ ( پیل ) هاتبي •
ع - ( الرجل والكتف - المنكب)

( پیسي )
ژپیس هاتیــە • ژێـدەرێ
بالقەدانە • خەرابي یە •
ع - ( النجس والملوث ) •

( پیری )
ژ ( پیر ) هاتیــە • ژێدەرێ
بالقەدانـــە • پیریتی ژی تێ
گۆتن • پیربونە •
ع - ( الکبر في السن - الکهولة)

( پینەچي )
پینە دوزە ( چي ) آلافەکـە •
کرۆکنـاف چێدکي • دبي
ژترکي هاتبي •
ع - ( المرقع ) •

( پیستوری )
چاف سۆری یە • زۆرکەری
یە • ع - ( الظلم ) •

## ( پێ ـ ت )

**( پیت )**

یا ( تیپ ) نافێ حەرفا یە • سۆرا دبێژن :ـ ( پیت ) وکورمانج دبێژن :ـ ( تیپ )• فێ پاشێ دناف بەرا سۆرادە بو دوبەندی • هن دبێژن :ـ ( تیپ ) راستە ، وهن هێ لسەر رکێ خوە مانە ودبێژن :ـ ( پیت ) راستە • لێ ئەز دبێژم :ـ ( پیت ) سەرگوهرێ تیپە • وەك : نك ـ كن ـ آلي ـ لاي ـ ( جمعه ـ جمعه ) •

ع ـ ( مقلوب ( تیپ ) القطعة ـ الحروف )

**( پیست )**

بجوكێ وی پیستكە • چەرمە كێپر تەنكە • ل سەر برینا ـ ل سەر پزكا چێدبي•

ع ـ ( غشاء رقیق فوق الجروح والفروح ) •

## ( پی ـ س )

**( پیس )**

نەباش ـ خەراب ـ نەدورستە خوارن و دەستانا وی •

ع ـ ( النجس ـ الملوث ) •

## ( پی ـ چ )

**( پیچ )**

بێژی یە • ژتركی هاتیە • مرۆڤێ نە ژباڤێ خوەیە •

ع ـ ( اللقیط ـ ابنْ الزنا ) •

## ( پي ـ خ )

**( پیخ )**

پێخیرە • من ب پیخێ وی گرت • من بپیخیرا وي گرتـ من بپێسیرا وی گرت

ع ـ ( ماحول فتحة الصدر )

## ( پي ـ ر )

**( پیر )**

اختیار ـ كال • پیری • پیریتي • ژ پیر هاتنە دەرباس بونە • پەرخاندنە •

ع – ( الـكهل ) •

( پیسۆر )
یا پیسۆري • باوەسـیری – باوەسیر – باسوره • نەخوەشی یەکە • دکەڤي داویا مرۆڤا – جاندارا •
ع – ( الباسور ) •

( پینار )
پینارآلي – پینارعلی – پەنارعلی – ناڤێ ایلەکە کوردە لرۆژآڤایێ ( قامشلۆ ) دکەڤي ( پەنار ) – کـاني یـه • عرب‌پەنار – کانیا عربا یه • دبي پەنارعلي – ( کانیاعلي ) بي • پاشێ بویـه ناڤێ وێ ایلێ کۆ ل هاویر وێ کـانیێ دانیـه •
ع – ( عین الماء ) •

( پیرەمەرد )
ناڤێ شاعرەکی کوردە ناڤدارە ژخەلکێ سلیمانی یـه • ناڤێ وی ( تەوفیقە ) •

( پیرەمیر )
پیرەمەردە • کورمانج دبێژن : ( مێر ) ێ سـۆرا دبێژن :– ( مەرد – مێرد ) •
ع – ( الرجل المسن ) •

## ( پي – ز )

( پیرۆز )
دبي ژ ( سپي رۆژ ) هاتبي • سڤک بویه و بویه ( پیرۆز )
ع – ( المبارك ) •

( پیڤاز )
ناڤدارە – پي‌وازه •
ع – ( البصل ) •

## ( پي – ش )

( پیش )
کارەکە لێ تێدە نەقـەنجي هەیه • دبێژن :– پیشێ تە ل فر چیه ؟ یاني ایشێ تە ل فر چیه ؟ – یاني تو هاتیه لڤـر پیشکنا بکي • پیشکێ تـه وەکي پیشکێ انگلیزن • ئـەز بپیشکێ تە زانم •
ع – ( الاعمال الضارة ) •

( پي – ژ )

( پیژ )
وەکە ( پیشه ) دبي‌هـەردو

بداخـــوازەكێ بن • ژپیژ ـ
بداخوازا پیژك ـ تـوژك ـ
كەلـــەم ـ خیب هاتیـــە •
پەرچەیەك داری سـەر توژ
و قەلاشتي یــە • بچوكێ وی
پیژكــە • پێ تفنێ چێدكن ـ
پێ سەوالا باربر تـــاژۆن :ـ
دبێژن :ـ مە پیژەك ل بــارام
خست ـ یانی مــن بدزی تێ
هلدا ـ نەقەنجەیەك پێ كر•
ع ـ ( الطعـــن من الخلف
والعمل الضار بالخفاء ) •

## ( پي ـ ك )

**( پیڤۆك )**

یا ( پيڤۆنگ ) نافێ گـەیاكی
یە • زارۆك دچنن ودخون•
كۆكا وی سپي یە • كلۆڤەرە
بـــەلێ وی زراف ودرێژن
گلك بلند نابي •
ع ـ ( نوع من الحشائش ) •

**( پیرەك )**

ژنە ـ ژنا پیرە • پاشێ بویـە
ناف ژبۆ هەمو ژنا •
ع ـ ( المرأة المسنة ) •

**( پیرك )**

دیـــا دێ و بافـە • پیلك ـ
داپیرە • لێ ژ وێ ژنكا كـۆ
دبەر زانێ دە آریكاریا ژنـــــا
آفس دكی رە تێ گــــۆتن
( پیرك ) • دبێژن :ـ رەوشێ
كەتیە بەر پیركا • یانی پیرك
لێ گهانە هەق ـ ژنێ پیر لێ
جفیانە • ئەو زاروكا كۆ چێ
دبي ژوێ ژنكا كۆ آری دیـا
وی كریـــە • ژوێ ژنكێ رە
دبێژی : پیركي •
ع ـ ( الجدة والدایة ) القابلة

**( پیلك )**

وەكە پیركە • سۆرانی یە •
ع ـ ( الجدة ) •

**( پیلك )**

هن زێر ، یا وەكـــە زێرن •
تەنك وارزان ژن ددن بـەر
سەرێ خوە • گلك جـــارا
ژزێررە دبێژن :ـ پیلـــك •
چەند پیلك لجەم فاتم هەنە•
یانی چەند زێر هەنە • فـــێ
پیلكا بگرە هلینە ڤازێرا بگرە•
ع ـ ( نوع من الذهب الخفیف )

( پیپیک )
جارنا بداخوازا نەپخـــاندن
تێ • دبێژن :ـ بـــارام زک
ل‌رەشێ کر پیپیـک یـــانی
آفس کر ـ نەپخاند ـ داگرت•
مە تورێ خوە داگرتن ، کرن
(پیپیک) • یانی تژەکـرن ـ
زێدەداگرتن •
ع ـ ( زیادة التعبئة ) •

( پینک )
خانی‌یێ مریشکایە • دبێژن :ـ
زۆرۆ پینک بـسەردە کەتیە •
یانی چویە دزیاهێکا ژبـــــۆ
کێماسي ولۆ دبێژن :
ع ـ (الکوخ) •

( پیسک )
بچوکـێ پیســـــە • (پیس)
دەرباس بویە تشتێ نەباشـــە
ـ نەپاکە •
ع ـ (مر) •

( پی ـ ل )

( پیـل )
ئەوروپی‌یە هاتیە کـــوردی •
ژبۆرۆناهي بـشەف بدەستێ
خوە دگرن ، ریا خوە پـــێ
رۆناک دکن •

( پیکۆل )
دەما دو ک دخوازن هـــەرن
شەرێ هەف پێ خوە لقدێ
دخن ـ دکۆلن قەبغۆ ژهەڤالێ
خوە دخوازن • بداخـــوازا
چاف‌سۆري‌یە پی‌ستوری‌یە •
پاشێ بویە تەڤایی :ـ
ع ـ (التحرش والاستفزاز )•

( پی ـ ن )

( پـین )
یا (پینە) • پەرچەیە • پینەچی
ـ پینەدۆز • وهارەنگە ( پین)
مەزنێ پینکە • کۆخـــــا
مریشکایە •
ع ـ (الرقعة والکوخ) •

( پیران )
نافێ گوندەکی‌یە •شیخ‌سعیدێ
کۆ دسالا ١٩٢٥ دە لبـــەر
ترکا لەب هلانی ، ژفـــــي
گوندی‌یە •راژۆرێ دیاربکرە
ع ـ (قریة مشهورة) •

( پیڤان )
دو نفش پیڤانهـــهنـــه :ـ
١ ـ پیڤانا بگازێ • بیڤانـــــا
بپیانێ • جاو بپیڤه • گهنم
بپیڤـــــه •
ع ـ (الكيل) •

( پیلان )
تهدبیر وخطهیه • دشـــهراده
داتینن • نهكوردی یه •
ع ـ (الخطة الحربية) •

( پیـــوان )
یا (پیوان) پیڤانه • سۆرانـــی
یه :ـ حاجی كهسی كـــــــه
بێ كـــهس بۆئـــێوه قور
دپێوی ••• گۆی لێ دكـــن
ظریفه نایكهن بهلا لهخۆتان••
(قور دپێوی) حهری وچراڤێ
دپیڤی •••

( پیژدان )
ناڤێ گهیاكی یه • وهكـــــه
پیژا دچــــی دەر • زارۆك
دچنن وناڤا وی دخـــــون •
مرۆڤ ایـــــرۆ دكـــــاری
ژ(كۆندان) ـ یا (كوردان) ره

پێژی : (پیژدان) پیژی كـــۆ
دخن بهر درانا •
ع ـ (العيدان) •

( پیرەمهگرون )
ناڤێ چیاكی یه • دبی ل هێلا
بازارێ سلیمانی یێ دكهڤی •
ع ـ (جبل) معروف •

( پیرەژن )
ژنا پیره • ناڤسهره یـــــه •
مهزنه• بناڤ سالا ده چویه•
ع ـ (المرأة المسنة) •

## ( تا ـ آ )

( تـــا )
یهكتا ـ یهكدانه یـــــه •
تاك گهیا ـ ترحهك گهیا •
ایسال زهڤیا مه تاك گهنـــــم
تێده پهیدا نابی ههمو گهیــا
وقونچره • سێتا گهیا دبـــن
قورمێ مێوێ ده شینهاتنه•ڤی
تایێ گهیێ بچنه •
ع ـ (الشتلة) •

( تـــا )
بارام بێههمتایه • بێههڤـــال

وهەمبەرە ـ کەسي وەکـەوی
پەیدانابي • ئەڤ هـــــەردو
کاینَ مەهە مِتـایێ هــەڤن ـ
ل گۆرا هەڤن ـ وەکە هەڤن •
نەتایێ فەرهادە •
ع ـ (امثال) •

( تــا )
نەخوەشيیەکە ـ مەلاریـــا
ژێرە تێ گۆتن • بارام تـــا
گرتیە • یا تا بارام گرتیــە •
شێرین کەتیە تایێ شێرکـــۆ
دتایێ دە یە •
ع ـ (ملاريا ـ الحمى) •

( تــا )
آڤـــداکێ بـــدە من • تاکي
بدە من ـ یەک تایي بدە من ـ
آڤداکێ بـــدە من • تـــاکي
بدارڤەکە ـآڤداکێ بدارڤەکە•
تاکي تێخە دەرزیێ ـ آڤداکێ
بـخە دەرزیێ •
ع ـ (الخيط) •

( تــا )
بداخوازا هەتا ـ حەتا •هاتیە •
تا بارام نەچی ئەز ناچـــم ـ
ئەمن ناڕۆم :
: ـ تا کەنگی ئەمێ هەر وەهە
رسوا وعید بن ؟ ••••
: ـ تا کەنگي ئەمێ کارکەرێ
آغا وبەگا بن ؟ •••
: ـ تاکەنگي ژهەڤ رە هەمي
مێرخاس وعگید بن ؟ •••
دفردە (تا) بداخوازا هــەتا ـ
حەتا یە •

( تاڤا )
گوندە • لنـــاڤ ( هەبزبنیا )
دکــەڤي • (تاڤێ) و ( تۆڤێ )
دو گوندن • لناڤ (ئۆمریا)نە
(تاڤ) ئەیوانە ـ یا کەڤاتــــێ
ئەیوانێ یە ـ ئەم دبێــژن :ـ
(کەڤانە) •
ع ـ (اسم قرية) •

( تانجيريا )
ولاتەک لئەفریقایە • دبــــن
دەستێ کۆلدارێ انگلیزدەیە•
ڤاسالا گەرەکە سەربەستيیــا
خوە بستینی ـ سەربخــــوە
بژی •
ع ـ ( مســتعمرة انكليزية في

افريقيا) ٠

## ( تا ـ ئه )

**( تازه )**
تەزە نویـــــە :ـ بارام تازه هاتیه ـ نوهاتیه ـ هێژا هاتیه ـ ایستا هاتیه ٠ (تەزه) ناڤـــێ مروڤەكي يــه ـ (مالامعۆتەزه) لرۆژآڤايێ (قامشلۆ) دكەڤن ٠
ع ـ ( الجديد ، الحديث ) ٠

**( تاخـه )**
يان (تاغــــه) ـ دەمەتــــەك (توتە) ـ دەستاك (گەيا)يە٠
ع ـ (الشدة) من الدخان ٠

**( تاوله )**
ماسه ـ مێزه ـ (ســفره) يه ٠ وەهارەنگه (تاوله) آلاڤــەك لێزتكێ‌يە ٠ بارام وفرهـــــاد بتاوله دليزن ٠
ع ـ ( الميز والطاولة ) ٠

## ( تا ـ ئۆ )

**( تاپۆ )**
دائراكە حكومتێ يه ٠ ملـك لسەر ناڤێ مرۆڤ قەيد دكى٠
(تاپوچی) ئێ تاپۆدكي ٠
ع ـ (دائرة التسجيل) ٠

**( تاجۆ )**
ناڤێ مرۆڤەكي يەه ژتاجالدين هاتيه ٠
ع ـ (اسم رجل) ٠

**( تاژدكۆ )**
ناڤێ مرۆڤەكــــي يه ٠ لناڤ ئۆمەريا ناڤدار بو ٠ دزەكـــي ناڤداره ٠
ع ـ (اسم رجل) ٠

**( تارۆ )**
ناڤێ مرۆڤەكي يـــــه ٠ ژ(تار) هاتيه ٠ (تار) ئەو چــــــەمبەرا دۆرا بێژنگ ومۆخل وئەربانا يه ٠
ع ـ (اسم رجل) ٠

**( تاخۆ )**
گوندەكە لژۆرێ (مديــادێ) دكەڤي ٠

**( تاكۆ )**
لسەرهەڤ آلاڤەكه ٠ تاكۆ ـ تاوەكو هەتاكۆ ـ هەتاوەكـــو

بداخوازەکێنە •

ع ـ (أداة بمعنى الى ان) •

( تەسۆ )

نافێ مرۆڤەکي يە • ژگوندێ ( تۆپزە ) ل‌نـــاڤ ( ميرسنيا ) دکەڤێ •

ع ـ (اسم رجل) •

( تانۆ )

نافێ مرۆڤەکی يە •

ع ـ (اسم رجل) •

## ( تا ـ ئو )

( تاهو )

آلاڤەکە بدخوازا پێ‌کەنـــين وتنازە• دبێژن :ـ تاهو ! وێ بارام ژمەرە تالانا ڤەگەرێني ؟

ع ـ (أداة للاستهزاء) •

## ( تا ـ ئي )

( تابي )

کۆزک وچەپـــەرە • دقادێ دە هاتيە کۆلان • دبـــژن : لەشکەرێ مە ايريشي ســـەر تابيێ دژمنا کر •

ع ـ ( الخنادق ) •

( تاپي )

ب‌شيوەکی کوردی (تاپۆ) يە• دەرباس بويە •

ع ـ ( التاپۆ ) وقد مر •••

( تازی )

روت وبێ کنجە • بارام تازی يە ـ روتە ـ بێ کنجـــــە • سەرتازی ـ سەرڤەکرییـــــە پی‌تازی ـ پێ‌روت ـ پێ‌خواسە

ع ـ (العرات) •

( تازی )

فارسا ژعەرەبا رە دگۆتـــن :ـ (تازی) يان پێ‌روت پی‌خواس ( ••• ) •

( تازی )

سەگێ نێچير وراوە • بەزايە• روتە • هن دبێژن : (تەعزی)

ع ـ (کلب الصيد) •

( تاری )

رەش وتاری بداخـــوازەکی هاتنە • (تاری) پەسنەکـــــی رەشە • رەشێ قەمەر هەيە ، رەشێ تاري هەيـــــە • شەڤا

تاری ـ شەڤا گلک رەشە •
ع ـ (القاتم ـ الحالك) •

( تاشتي )
يا تاشتێ • خوارنا سپيدێيە •
تاشتيا جوتکارا ، تاشتيـــــا
کارکەرا •••
ع ـ (الفطور في الصباح) •

( تاڤێ )
تاڤانێ بارانێ نە • تاڤيێ بارانێ
تاڤيەک باران خوەبەردايـــە
سەر زادێ مە •
ع ـ (المزن) •

( تاقي )
خەفتانە ـ کەوايــە ـ قەبايە •
: ـ تاقيکێ تە بەلەکە تاقـــي
بـەلـــەکێ يـــەمـــان •
: ـ پشکۆژا سيە ويەکە تاقـي
بەلەکێ يەمان •
ع ـ ( ملبوس خاص للنســـاء
کالمرط المرحل) •

( تاکسي )
ئۆتۆموبێلە • بچوکە ، بکرێ
مـــرۆڤا ســـوار دکـــی •

نەکوردی‌یە • لێ بويـــــە
کوردی • فارس وعـــــرب
وترک ژي ولۆ دبێژن •
ع ـ (تاکسی) •

( تالي )
تەحلي يە • (تــوز ـ شۆر ـ
ترش ـ تال ) ••• ژتـــام تێ
ژمارتن • فارس دبێـــژن :
(تەلخ• بەلێ صەبر تەلخەست
ئـەما بەرێ شـــێرين دارەد •••
ع ـ (المرارة) •

( تانزي )
ناڤێ شاعرەکي کـــوردە • ژ
گوندێ ( تانزێ ) يە ناڤێ وی
( ابراهيم )• • بزمانێ عربي
گلک شعرێ خوەش چێکرنە
ع ـ (اسم شاعر کوردی) •

( تاوي )
ئەو مرۆڤێ کۆ دتايێ دە يە ـ
تا دکری • بارام تاوی يە •
تاوی هەردەمە ـ (تاوی‌وباوی)
ئێ بـتا وئێ ببا نە •
ع ـ (المريض المزمن بالملاريا)

## ( تا ـ ئێ )

**( تاشتێ )**
ـشتي ـ تێشته • خوارنـــــا
سبەهێیە • دەرباس بویە •
ع ( مر ) •

**( تاخێ )**
گونــدەکـــــه • ل راژۆرێ
( بەدلیس ) دکەفي • مــــالا
شێخێ تاخێ ناڤدارن •
ع ـ ( اسم قرية ) •

**( تاڤێ )**
ژ ( تاف ) هاتيه • روناهيـــــا
رۆژێیە • تاڤێ دایه دیارا ـ
روناهیا رۆژێ دایه دیارا •
ع ـ ( نسبة الى (تاف) الضوء )

**( تاڤێ )**
گوندەکه • ل‌ناڤ ئۆمەریـــــا
دکەڤي • تاڤێ وتوڤێ لجــەم
هەڤن • ع ـ ( قرية ) •

## ( تا ـ ت )

**( تابوت )**
ژدارا چێدکن • مریـــا تێ
ده ڤەدشـــێرن •
ع ـ ( التـابوت ) •

**( تات )**
ناڤێ ائێلەکه عربه • ل ژێرێ
( ماردين ) دکەڤي ( تـــات )
دآورا کورمانجا ده بن‌دەست
وجوتکاره هـــەمو ائێـــل
وعشیرێن کورد دکــارن مالێ
وا ب‌خون • ژهەڤره دبێژن:ـ
ما ئەز تاتێ باڤێ تە مە ؟ ـ یانی
ئەز نەجوتکارێ باڤێ تە مە ـ
نەکۆلەیێ باڤێ تە مە • :ـ لێ
ایرۆ ائێلا ( تات ) وەکه هەمو
کـــوردێ بن دەســـــتێ ترکا
بن‌دەست وبێ‌هاڤلن •
ع ـ ( الفلاح الرق ) •

**( تالات )**
گوندەکه • ل‌ناڤ ئۆمەریـــا
دکەڤي • تالات ( تـــــات )
لجەم هــەڤن ( تاژدۆ ) دزێ
ناڤدار ژتالاتێ بو •
ع ـ ( اسم لقرية كوردية ) •

**( تایت )**
ناڤێ صـــابونەکێیە • گلك
پروپۆغان ژێ‌ره دبي • ايرۆ
شوشتنا کنجا بگر هــــــەمي

بتـايتــه •

ع ـ ( نوع من الصابون ) •

## ( تا ـ س )

**( تاس )**
پيانه ـ پيانه يه ـ پەيالەيـه •
عرب ژی دبێژن :ـ ( تـاس )
لێ نزانم ژكو هاتيه •
ع ـ ( الطاس ) •

**( تاوس )**
ناڤێ تەيرەكی جوان ورنده •
( سيابوش ) شاعرێ ناڤـدار
دبێژی :ـ
( تاوس بڤی شكلێ بديـع
شەرمەندەئێ ساقێ درەش )•
ايزيدی ( ژ ئەهرەمـەن ) ره
دبێژن :ـ مەلكي ( تاوس ) •
ع ـ ( طاوس طير معروف ) •

## ( تا ـ ج )

**( تـاج )**
كولاهەكه تێدە كـەڤرێ
گەوهەر • هەنه • پادشـاه
ددن سەرێ خوه نيشـانـا
پادشاهي يه •

ع ـ ( معروف ) •

**( تازج )**
ژ ( تازه ) دەركەتيه • بويـه
تركی تازجه پاشێ بويــــه
عربي ( طازج ) بداخوازا تو
ـ تازه چێ بويی •
ع ـ ( الطبخ الجديد ) •

**( تاراج )**
تالانه ـ بەرباتیيه • ددیوانـ
مەلایێ جزیري ده هاتیه •
ع ـ ( النهب ) •

## ( تا ـ خ )

**( تاخ )**
تاره ـ تاخا مه ـ تارا مەيه •
گوندێ مه دو تـاخن ـ دو
تارن ـ دو پەرچه نه •
ع ـ ( الحارة ـ الحي ) •

**( تاخ )**
تاخمه ـ تاخمێ پەل وگەيــ
وتوتنه • تاخەك توتن بــد
من ـ تاخمەك توتن بدەمن •
توتامه تاخ تاخ ل سەرهــڤ
هاتيه راخستن قات قاتــه •
ع ـ ( الحزمة ) •

**( تاريخ )**
مێژوه ـ كـــەفـــــاره يه ـ رابۆرى‌يه • دفلان تاريخێ‌ده ئەز هاتمه • وهارەنگه تاريـخ بويه ناڤێ وا نفشتێ كـــۆ ژتاريخێ دپەيڤن • تاريخـــا شەرفخان ـ نفشتا شەرفخانه • كورد وفارس وعرب وترك هەمـــو دبێژن :ـ تاريخ • لێ كوردێ ســـۆران ڤێ پاشي‌يێ ( مێژو ) لـشـــونا تاريخ دنفيســـن • ( مێژوى ئەدب ) تاريخا هۆزاني يه •
ع ـ ( معروف ) •

## ( تا ـ ر )

**( تار )**
رەشه • تاري ژتار هاتيــــه • تار ـ تاري زێدەبونا رەشێ‌يه• رەشي وتاري بدوفهـــەف ده گلك جارا تێن •

**( تار )**
ژدار چێ‌دكن • دۆرا بێژنگ ومۆخل وسەراد وئەربانا يه • وهارەنگه (تەپكا ) پێ چێ‌دكن خوشكێ تارا خوه بده مـــن ئەزێ تەپكێ خوه پێ چێ‌كم• تارا سەرێ رەوشێ گازەكێ بلنده ـ تارا ســـــەرێ ژنـــا دارەكه دكۆڤيا ســـەرێ وا ده يه • ع ـ ( اطار ) •

**( تابور )**
پەرچاك لەشكەره • هـــەزار مرۆڤه • دبي ژتركي هاتبي •
ع ـ ( طابور ) •

**( تاتار )**
يا ( تـــەتـــەر )ـ نفشـــــەك ژتركێ ( مەغۆلن ) •
ع ـ ( شعب من الاتراك ) •

**( تاغور )**
شاعرێ هندێ ناڤداره •
ع ـ ( شاعر هندي معروف )

**( تاكۆر )**
ناڤێ ائِلەكه كوردە لـرازێرێ بـــاژارێ وان دكـــــەڤي • حسين‌بەگێ تاكۆري دسترانادە ناڤـــداره •
ع ـ ( قبيلة كوردية ) •

( تالۆر )

کوندەکە • ( تالۆری ) یە •
خەلـکێ گوند فـــەلەنـــە •
نافدارن دبن دەستيیا خوەدە •
دبێژن :ـ ئـــەز ژفـــــلەهێ
تالۆريیێ بمئەگەر ئەف یەك
ژتەرە بـمێني •
ع ـ ( قريـــة ) •

( تامۆر )

گژکە ـ قژە • پورێ زێـدە
ونەشــــــوشتيیە • دبێژن :ـ
تامۆرا سەرێ رەوشێ بنەرن
چاوايە • وهـــارەنگە تامۆرا
دەفيیێ ئەوە کۆ گلگ دارێ
هور ژقورمەکی دەرکـــەفن
دبێ وەك تـامۆرا ســـەرێ
مرۆفا یا تامۆرا سەرێ مرۆفا
وەکە تامۆرا دەفي یێ یە •
ع ـ ( الكثافة في شعر الرأس )

( تامسار )

بێتامە • نەخوەشـــە •
ع ـ ( بدون طعم ) •

( تامر )

نافێ مرۆفا یە • ( تەمرە ) •
کورد دبێژن :ـ ( تـــەمر )
وعرب دبێژن :ـ ( تـامر ) ـ
( تەمو ) یە •
ع ـ ( اسم رجل ) •

( تانێر )

نافێ گوندەکی یە • مـــــلا
ابراهیمێ تانێری نافـدارە •
دبي لـژۆرێ شـــــــارێ
( بەدلیس ) بي •
ع ـ ( اسم قرية ) •

( تاهر )

بابا تاهرێ هەمەداني • شاعرێ
کوردێ نافدارە • یەکـــــەم
شاعرە کۆ بکوردی شعر دانیە
ع ـ ( شاعر کوردی ) •

## ( تا ـ ش )

( تاش )

گوندە • لـژێری رۆژهـلاتێ
( قامشـــــــلۆ ) دکەفي ـ

( تالش )

دبي نافێ گوندەك ، یـــــان
باژارەك ، یان وەلاتەك بي •
دکەفي آزەربایجانێ ( مصطفی
بـگێ تالش ) دتـــــاریخێدە
نافدارە

## ( تا ـ ڤـف )

( تاف )
رۆناکه • تاف بارانه :ـ تافا
رۆژێ ••• رۆناکه • تافـا
بارانێ آفه ـ بلرانا خورتـه •
( تـافـانـه ) •
ع ـ ( الضوء ) •

( تافههیف )
دهمبهر شـهڤرهش دهتێ •
دبێژن :ـ ایشهڤ تافههیڤه •
یانی نهشهڤرهشه • یانی هـــهیف
برۆناکه •
ع ـ ( الليلة المقمرة ) •

( تایف )
پهرچاکێ :ـ ( حجــازه ) •
لجـهم مـــهتریێ تایفي
نفشهکێ تریێ خوهشـــه ،
درێژه •
ع ـ ( مقاطعة من الحجاز ) •

## ( تا ـ ق )

( تاق )
کهڤانه یه • تاقا پاجێ ـ کهڤانا
پاجێ یه •

( تاق )
قاته • دوتاق • دوقـــاته ـ
دوجاره • ئهزێ دوقات لـتـه
بستێنم ـ ئهزێ دوتاق لـتـــه
بستێنم • وهکه ههڤن •
ع ـ ( المرة ـ القدر ) •

( تابوق )
قهرمیتن • عــراقي دبێژن :ـ
تابوق • خانییێ مه ژتابوقـــا
هاتیه آفاکرن ـ ژقهرمیتـــــا
هاتیه آفاکرن •
ع ـ ( معروف ) •

( تارق )
ناڤێ گهرناسهکي عربـــــه •
دتــــاریخێ ده ناڤـــــداره •
( جبل تارق ) دناڤبهرا دهریا
سپي ومهزن دهیه • دبێژن:ـ
دهما تارق دهربـاسي وی آلي
آڤێ بو گهمییێ خوه ههمـو
شهوتاندن وگۆت :ـ لپێشـیا
مه دژمن ولی پاش دهریایه •
ایدیهون دزانن :ـ دخوازن
بـرومهت بـپێش دههـــهرن
وبمرن ، یـان دلبترس دآڤێ

ده بمرن •

ع ـ ( معروف ) •

**( تاشناق )**

جڤاته‌كه ئه‌رمنايـــه • دژمنێ سۆفيتستانێ يه • دخـــوازن ئه‌رمنستانا مـــه‌زن چێكن لێ بده‌ستێ كۆله‌دارا • دگـــل جڤاتا ( خوه‌يي بون ) يـــا كوردى چه‌ند ته‌ڤگه‌ر كرنه •

ع ـ ( جمعية أرمنية ) •

## ( تا ـ ك )

**( تاتك )**

يا ( ته‌حتك ) كـــه‌فره‌كى پانه ـ په‌حنه • دبن قادێ ده هنك ژێ ژ ده‌رفـــــه‌يه • دبێژن :ـ مه ساڤارێ خوه ل سه‌ر تاتێ ـ ته‌حتێ كوتايه •

ع ـ ( الصـــــخور الموجودة معظمها في الأرض ) •

**( تاسك )**

بچوكێ ( تاســـــه ) • وێ تاسكێ بده من • ئه‌ڤ تاسـكا زينێ‌يه • دلشا تاسكا خـــوه وندا كريه •

ع ـ ( تصغير للطاس ) •

**( تاچيك )**

نـــاڤێ مللەتـــــه‌كي يه • تاچيكستان ايرۆ ده‌وله‌ته‌كه ـ جه‌مهوري‌يه‌كه ژسۆفيتستانێ سه‌يدايێ خاني دبێژى :ـ

:ـ ئـــــه‌ڤ قلزه‌مێ رۆم وبه‌حرێ تاچيك

**هنـــــگي** كۆ دكن خروج وتحـــــريك

كورمانجێ دبن بخـــون ملطـــــــخ

وان ژێك ڤـــه‌دكن مثالێ **بـــه‌رزه‌خ** •••

دبي دوێ چاخێ ده تاچيـك دناڤ ايران ده‌بي ژبه‌ركـــۆ كورد بن‌ده‌ستێ رۆم ـ ترك و تاچيـــك ـ عجم ده‌بون • كه‌نگي رۆم وعجما شه‌ردكرن كورد دناڤ وان ده دپه‌رچقين چاوا تاريخ ددي زانين •

ع ـ ( شعب سوفياتي ) •

**( تاخك )**

بچوكێ ( تاخه ) • ده‌ربـاس

بويه • تاره • ئه‌گه‌ر ژتاخـا
توتنێبي ( ك ) ژ بۆ يه‌كه •
يه‌ك تاخ •
ع ـ ( تصغير ( تـاخ ) بمعنى
الحي وقد مر ) •

**( تارك )**

بچوكێ ( تاره ) تاخــــه •
ع ـ ( تصغير ( تار ) الحي )•

**( تاره‌ك )**

يـــه‌ك تاره • بداخـــوازا
چه‌مبه‌ره • ع ـ ( مر ) •

**( تاريك )**

بچوكێ ( طارى ) يه •
ع ـ ( تصغير للظلمات ) •

**( تاڤك )**

بچوكێ تاڤه • رۆناكه •
ع ـ ( الضوء ) •

**( تاڤيك )**

بچوكێ تاڤي‌يه ـ خــه‌فتانه
ـ كه‌وايه ـ قه‌بايه •

**( تاكتيك )**

(الخطة) پێلانه • ئه‌ورووپي‌يه‌•
تاكتيك وستراتيج ئه‌ون كـوٚ
مرۆڤ د شــه‌رده بـخوازي
جهـــكي بگرى • ئه‌و جي
ستراتيجه ، لێ آوايێ ايريش
وچون وفه‌گه‌ر تاكتيـــكه ـ
خطه‌يه • پيلانــــه • ياني
( آرمانج ) وآوايێ گهاندنـــا
آرمانجێ • ع ـ ( الخطة ) •

**( تاكتوك )**

بكوردى هورومورن ، يــــا
ته‌ك‌ته‌كێ كۆبلاوه‌لا مانـه •
دبوستانێ مه ده هێ تاكتوكێ
شه‌به‌شا مانه • ياني ته‌كته‌كێ
شه‌به‌شێ بێ‌خێر مانه •
ع ـ ( ما تبقى من المخلفات )

**( تالك )**

يا ( ته‌حلــــك ) • ئــــه‌و
په‌تيخێ تالن ـ ته‌حــــلن ـ
نه‌گهايي‌نه •
ع ـ ( البطيخ المر ) •

**( تاوك )**

بچــــوكێ ( تـــاوه ) يه •
( رون‌پێژه ) • ژتركي هاتيه•
ع ـ ( المقلية ) •

**( تانگ )**
ئەوروپي‌يە • زبۆشـــەرە • پولادە • ناڤدارە •

## ( تا ـ ل )

**( تـال )**
بداخوازا ( تەحلە ) ع ـ(المر) تالی ـ تەحلي • ع ( المرارة ) ئەڤ گەیا تالە ـ تەحلە •

**( تـال )**
خوەدایە بەر تالا بارام ـ خوە دبەردە ڤەشـــارتی‌یە • وەرە خوە بدە بەر تالا من ـ خوە بدە پاش من ـ خوە دپشـت من دە ڤەشێرە •
ع ـ ( الاختفاء وراء الشيء )

**( تاڤل )**
بداخوازا ( دبي ) • دبێژن :ـ دەنگێ خوە هلمەدە ؟ تاڤـل فەرهاد ل مال بي • :ـ تاڤـل هنەك بـســەر مە دە بێن ؟ تێدە ترس وپرس هەیە •
ع ـ ( لعـل ) •

## ( تا ـ م )

**( تام )**
زعربي هاتیە • ( طعم )ە • تاما ڤێ خوارنا وە نەخوەشـــە • گۆشتی وە بێ تامە ـ •
ع ـ ( طعمە ) •

**( تاخم )**
تاقم ـ تەقم بداخوازە كێنە • تاخمێ درانێ رەوشێ نەباش چێبونە • خانمێ تاخمـەك زمالا خوەرە كریە • مـەیرۆ تاخمەك زخوەرە چێ‌كریە •
ع ـ ( الطقم ـ البدلة ) •

## ( تا ـ ن )

**( تابان )**
گرەكە دزێرێ حسكادەیـە • گرێ‌تابان لجزیرێ ناڤدارە •
ع ـ ( اســـم تل في جنوب الجزيرة ) •

**( تاپان )**
پی‌یێ دەڤـــانـــە ـ پێ‌یێ حوشترە • تاپانێ دەڤا مـەزن وفرەهن • ع ـ ( المنسم )•

**( تاران )**
ناڤێ پایی‌تەختـــا ایرانێ‌یە • شارێ تاران ناڤدارە •
ع ـ ( عاصمة ايران ) •

**( تاڤان )**

ئــەو بارانـــا كۆ دبهارادە پەرچەپەرچە تێ :ـ ایـــرۆ تاڤانێ ل مـــەکر ـ بارانێ ل مەکر تاڤان کتیە سەر گەلي٠٠ دبێژن :ـ تاڤـــانێ بهـــارێ لسەرێ ( گێ ) دکي وداویا وی زوا دمێني ٠
ع ـ ( المزنة ) وقد مر ٠

**( تالان )**

پەرباتي ورەڤاندنا مالێ دژمنە٠ دژینداریا خوەدە ئەم سێ‌جارا تالان بونە ٠ :ـ دژمن تالانێ مە بر ـ پەز ـ سەوالێ مە بر
ع ـ ( النهب والغارات ) ٠

## ( ته ـ آ )

**( تەبا )**

جانداریێ کۆ نـەمرۆڤـــە ٠ جاندار هەمو دو پەرچەیە :ـ
١ ـ مـــــرۆڤ ٠ ٢ ـ دوەم ( تەبا )٠ تەبا ژي دوپەرچەیە:
١ ـ کەدی ـ ٢ ـ هۆڤ ٠لێ ب آوایێ نفش تەبا چەنـــد پەرچەیە :ـ
١ ـ تەبایێ آفي ٠
٢ ـ تەبایێ بەژی ٠
٣ ـ فرۆك ـ گـــەرۆك ٠
ئەڤ ژی هەریەك چەندنفش پەیدا دبن ٠
ع ـ ( الحيوان ) ٠

**( تەبا )**

دگل ٠ بسکان بزلفانرە تەباە پێکوە ـ بهڤرە ٠

**( تەڤا )**

کۆما ( تەڤە ) ـ تەڤ وەرن ـ گشت وەرن ٠ تەڤا وەرینـــە ـ گشتکا وەرینە ٠
ع ـ ( كلهم ) ٠

**( تەڤا )**

بپایە ٠ بارام تەڤایە ـ بپایە یە ٠ لێ نەل‌گۆرا پایەداریـــا خوەیە ٠
ع ـ ( الانانية ) ٠

**( تەکیا )**

خانەگاهە ـ خانقاهـــە ٠ دبي زعربي هاتبي ٠ تەکیا مـــالا شێخ خانقـــاها شـــێخە ـ خانـگەهە ـ خوانـگەهـە ـ

خوارن گه‌هه ـ خواردن گه‌هه •
ع ـ ( التكية ) •

( ته‌نا )
ته‌نێ ـ ته‌نیا ـ تـــه‌نها یه •
ژزارۆكێ بچــــــوك ره
تێ گۆتن :ـ ته‌نا ـ ته‌نا •••
یانی لسه‌ر ته‌نا خوه ته‌نیـا ـ
ته‌نها ـ ته‌نێ راوه‌سته • هـــن
دبێژن :ـ تـــه‌نێ تـــه‌نێ •
:ـ بته‌نا كرێس رابوم ســه‌ر
خوه • یانی ته‌نێ ته‌نیا ـ ته‌نها
كراس لمن بو ده‌ما رابوم •
:ـ م گۆتبو بــــه‌ره گوندي
هه‌مو بێن لێ بارام بته‌نــــا
خوه هاتیه ـ ته‌نێ هاتیــــه ـ
ته‌نیا هاتیه ـ ته‌نها هاتیه •
ع ـ ( وحـده ) ـ ؟

( ته‌ماتا )
باجانا سۆره • هـــن دبێژن ـ
باجانێ شامي • هن دبێژن :ـ
افرنجي • هن دبێـــژن : ـ
(ته‌ماتا) •
ع ـ (بادنجان الاحمر) •

( ته‌ماشا )
لێ‌نه‌رینه • وه‌ر ته‌ماشا بـكه
گۆڤه‌نـــدێ ـ لگۆڤـــه‌ندێ
بنێره ـ مه‌یزه‌كه •
ع ـ (التفرج) •

## ( ته ـ ئه )

( ته‌بانچه )
آلافه‌كه • دسازبه‌ندی ده تـێ
خویاكرن • خانـی دبێژي :ـ
(لێدایه ده‌فا مه بێ ته‌بانجه) •
دبي ئه‌و دارك ـ كــۆپال ـ
شفكا كۆ پێ لده‌فێ دخن ؟
ع ـ (آلة موسيقية) •

( ته‌په )
بچوكێ وی ته‌پكــه • گره ـ
گرده • قه‌ره ته‌په ـ گــرێ
ره‌ش ـ گـــردی ره‌شــــه •
ژتركي هاتیه یا تركا ژكوردی
ستاندی‌یه • ژبه‌ركۆ ته‌پــك
دتركي ده نینه • گه‌ره‌كــه
ژكوردی ستاندبن •
ع ـ (التل) المرتفع

( ته‌زه )
یا(تازه) بداخوازا نویه • ته‌زه

خوارن چێ بویــه ـ تـــازه
چێ بویه ـ نوچێ بویه •
ع ـ (الجديد والحديث)

( تەقەزە )
بەجي ـ ب‌جي • ژبۆ تأكيده •
تەقەزە بـــەره بارام بـــێ •
ئەبي ـ دبي ب‌جي بێ •
ع ـ (للتأكيد) •

( تەنەكە )
تەنـــەكا دمسێ ـ تەنــــەكا
گازێ ••• دبــي ژتەنـــــك
هاتبي • زۆر ـ پر ـ گەلـك
تەنكە •
ع ـ (معروف) •

( تەوتەوە )
مرۆڤێ كۆ بەرخوه نەكەڤي •
دبێژن :ـ بارام تەوتەوە يە •
كەس گوەنادي گۆتنێ وی •
لجەم من ژ(تەو) هاتيە • دەما
دەنگبێژ دسترێنن گۆرانــــی
وبەستە دبێژن • يەك هەيــە
دبەرڤە دبێ :ـ تەو تەو ••••
ئەوێ كۆ دبێژی :ـ تەوتەو :ـ
هەڤالێ وايە لێ ژڤـــــي آواي

پێڤە تشتەك پێ نابي • ژلەورا
كورمانج دبێژن :ـ مرۆڤــێ
بێ‌كێر تەوتەوە •
ع ـ (سەرسەری)

( تەبسي )
ياتەبسك • ئەو سێنيا كـــۆ
مرۆڤ قـــەهـــوێ ـ چايێ ـ
شيراني لسەر دكي وتێني بەر
مێڤانا •
ع ـ ( الصينية الصغيرة ) •

( تەبايي )
پێكوه ـ پێكڤه ـ
ع ـ (مجتمعا) •

( تەبلي )
خوەلي دانكه •
ع ـ (النفاضة) •

( تەری )
دوڤه ـ كلكه • ژدوڤێ كەرێ
رە تێ گۆتن (تەری) •
ع ـ (الذنب) •

( تەرزی )
درون‌كـــەرە ـ درون‌كارە •
ئێ كۆ درونێ دكي •
ع ـ (الخياط) •

( تەزی )

زۆرسارە زۆرساردە • آڤــا
تەزی ـ آوی ساردە •
ع ـ (البارد) •

( تەشي )

ژن پێ ریس چێدکـــن •
شێرین تەشيێ درێسي •
ع ـ (المغزل) •

( تەفتي )

خوارنەکە • ژگۆشـــت ودان
چێ دکن • ایشەڤ شیڤا مـــە
تەفتيیە • مە تەفتي چێ کریە •
ع ـ (أكل من اللحم والحـب
المدقوق) •

( تەڤزی )

یا تەڤزینۆك • خوین باشـ
ناگەری • تـەڤزی تێنە لاشێ
مرۆڤ • دەمـا مرۆڤ رودني
ورادبی خوین دخـــوازی
ڤەگەری شونا خوە ژلـــەورا
تەڤزی نۆك تێنە لاشــــێ
مرۆڤ •
ع ـ وقوف الدم في بعـــض
الجهات من الجسم والرجوع
الى مكانها •

( تەکسي )

یاتاکسي • دەرباس بویــــە •
ئوتوموبیلا بچوکە کۆ مرۆڤـا
باردکي ـ سواردکي •

( تەمەزي )

(ئەپری)یە ـ ( بۆشي ) یە •
تە مەزیا ســەرێ شــــێرین
گەلەك جوانە ـ خوەشکـــە
ع ـ (ایشارب) •

( تەمبەری )

زپۆرێ خورتارە کۆ بســەر
ئەنيیا وا دە تێ خوار تـــێ
گۆتن • درستە کۆ ژبـــۆ
کەچا رە ژی بێ گۆتن :
:ـ هەرچقا گەور وسپي بــن
گەردەن ودێم وئەنی • تەمبەري
رەنگێ شەڤا تاري بســـەردە
رەش دبي • هن دبێـژن : ـ
تەمبـــۆری ـ بچوکـــێ وی
تەمبۆریکە •
ع ـ (الزلف) •

( تەنپەری )

لاش پەری یە • تەنا وێ ـ لاشێ وێ وەکە پەریا یە ـ وەکە ئێ حوریایە •
ع ـ (التي يشبه جسمها جسم الحواري) •

( تەنوری )

چەپونە یە • نیف کراسە • ژ نەوقێ بەرژێر چێدکن ژن لخوە دکن •

( تەنجەری )

بەروشەکە مەزنە • تێدە خوارن وگەلەک تشتێ دي چێدکن •
ع ـ (الدست) •

( تەنی )

رەشیا بنێ بەروشێیە •

( تەنزەری )

لاشێ وێ وەکە ئێ زەریا یە ـ وەکە ئێ خاتونا یە • (زەری) کەچێ مالمەزنا نە • زەريێ (مالاگالۆ) دسترانا دە هاتنە • ( سیاەپۆش )

شاعرێ کوردێ نافدار دبێژی :ـ یارب ! چەعجێب مامە ژفێ حسن وجمالێ فێ دێمزەری وسورپەری وحورە مثالي ••••
ع ـ ( الست النفيسة ) •

## ( تە ـ ئێ )

( تەپێ )

گوندەکە • لسەرچەمێ دجلە لناف بارافایە دبێژنێ تەپابارافاە مەلایێ تەپێ دشەرێ سالا ١٩٢٥ دە بقرکا مدیرێ تەپێ گرت وگۆت :ـ هاتي دەورا ئەحمەدی دمورا وە چو ولات وعزا دێ بکەت بێ آف وروو ـ لێ پاشێ سەیدا بسنگوێ دژمن هاتە کوشتن • نافێ وی دديوانا من دە هاتیە نفیسین •
ع ـ (قرية مشهورة) •

( تەپکێ )

گوندەکە • ل بەرۆژێ (قەرەچوخ) دکەفي دناف ائیلا کۆچەرێ میرا دەیە •
ع ـ ( قرية ) •

( تەبولێ )
خوارنەکە • عربي‌يە •

( تەتێ )
ناڤێ مرۆڤەکي يە • مالا(تەتێ) ژگوندێ (ڤاڤێ)نــە • (ڤاڤ) باژارەکي بچوکە کەڤنارەيــە وێرانە • پێژە ديوارێ بلنــد دسەرێ کەلەها ڤاڤێ دە بلنـد خويادکی • لناڤ ئۆمەريــا درۆژهلاتێ (ماردين) دەيە •
ع ـ (اسم رجل) •

( تەحلکێ )
ناڤێ گوندەکی‌يە • لژێـــرێ باژارێ عامودە ـ امودە دکەڤي
ع ـ (اسم قرية) •

( تەڤێ )
گوندەکە • دناڤبەرا هەبزبنيا ودێرەڤەريا دەيە • ناڤدارە • بکوردی وعربي دپەيڤن •
ع ـ (اسم قرية) •

( تەمێ )
ناڤێ مرۆڤايە • ژ(تەمــــەر) هاتيە •
ع ـ (اسم رجل) •

( تەنێ )
تەنها ـ تەنيا يە • بەرە بەرام تەنێ بێ • ئەزێ تەنێ هــەرم
ع ـ (الوحدانية) الانفراد •

( تەنزێ )
باژارەکی کوردە تاريخي‌يە • ابراهيم شاعرەکي ناڤـــدارە دتاريخێ دە ژگوندێ(تەنزێ) يە •
ع ـ (اسم قرية) •

## ( ته ـ ئۆ )

( تەخ بەشۆ )
ناڤێ ليزەکە کورمانجـی‌يە • بشەڤ زارۆک پێ دليزن :ـ دو زارۆک يەکي ، ياعباکـێ دخن ناڤبەرا خوە وزارۆک دبن دوبر جارێ ژڤێ بـــرێ يەک وژوێ برێ يەک تێنن جم خوە ونـاڤێ وا ژهــەڤ دپرسن ودبێژن :ـ ناڤـــێ دژمنێ تە کی‌يە ؟ ئێ کـــۆ دناڤـــێ هەمبـــەرێ خـــوە دەرنەخست هڤالێ وی ژێ‌رە

دبێژی : ـ تەخ‌بەشۆ ! یانی
یابەشۆ ! پاشدە فەگەرە • لێ
پاشێ بویە ناڤێ مرۆڤێ کۆ
ژ پاش هەڤالێ خوە وژترسا
ڤەدگەری دبێژن : ـ بارام
تەخ‌بەشۆ بویە •
ع ـ (الانهزامي) •

( تەختەشۆ )
یا(تەنەشۆ) ئەو تەختێ کۆ
مریا لسەر دشۆن •
ع ـ (مغسلة الاموات) •

( تەریشۆ )
ناڤێ وی مرۆڤێ کۆ کنجێ
کەڤن ورزیایی لخوە دکی •
(تەریش) زیتۆرە • زۆلەکە
زراف ودرێژە : ـ تەریشێ
کراسێ بارام ـ تەریشەک
جاو ـ تەریشەک نان ـ
تەریشەک ژ زەڤیا بارام •••
ع ـ (اسم رجل يلبس الخرق
البالية) •

( تەرزۆ )
ناڤێ ژنەکێیە • دبي ژتەرزی
هاتبي • (تەرزی) ئێ کۆ
کنجا ددروی •
ع ـ (اسم امرأة) •

( تەرازۆ )
یا (تەرازو) مێزێنە ـ شاهینە•
دچیرۆکا شێر وپلنگ ورۆڤی
دە ددیوانا من دە ناڤێ
(تەرازو) هاتیە :
: ـ رۆڤێ گۆ دە رابن زو
ژمەرا بینن (تەرازو)
وان (تەرازو) آنی بەر
رۆڤێ‌پەنیر دانی سەر
گە ئەڤ خوار وگە ئەو خوار
هەتا کۆ ما بەن و دار •••

( تەڤشۆ )
یەک‌دەڤە • تۆزە • پێ دارا
دتەرشێنن شایک ـ لوس
دکن :ـ
تەڤشۆکێ دەست نەجارا
نارونی •••
چێدکم دەرگۆشێ یارا
کورتکێ رندکێ •••
ع ـ (القدوم) •

( تەنشۆ )
(تەختەشۆ) یە ••دەرباس‌بویە•

مریا لسەر دشۆن •
ع ـ (مر ذكرها) •

( تەوفۆ )
ناڤێ آغاكێ كوردە بدەستێ فرنسا ل شارێ آمودە هاتە كوشتن • بمێرانی ناڤدارە •

## ( ته ـ پ )

( تەپ )
ناڤێ دەنگێ كەتن ولێدانا تشتەكی یە :ـ سێڤ ژبانی دە گۆ :ـ تەپ وكەت • تەپا خوە لێ دا ـ كولما خوە لێ دا ـ گۆ تەپ وكولەك لێدا •
(تەپ یا تەپێ) ناڤێ گوندەكی لناڤ باراڤایە • دەرباس بویە • (تەپو ـ تەپێ) ناڤێ لێزەكە زارۆكایە • تەپا خوە لهەڤ ددن •

( تەرپ )
وەكە (تەپ) ددەنگێ خوە دەیەكن •
ع ـ (كلمة صوتية عند وقوع الشیء او ضرب الشیء) •

( تەرتەپ )
ناڤێ گوندەكی یە لژێرێ قامشلۆیە •
ع ـ (اسم قریة) •

## ( ته ـ ت )

( تەحت )
یا (تات) ـ دەرباس بویە • كەڤرەكی ـ لاتەكە مەزن وفرە • گلك جارا پرێ وێ دبن آخێ دەیە •
ع ـ (الصخور الملساءالكبیرة)

( تەخت )
تەختێ پادشاە ئێ ل سەر رودنی پایتەخت جهێ كو تەختێ پادشاە لێیە •
ع ـ (العرش) •

( تەخت )
پشتێ كۆ دارا پەرچە دكن دبن تەخت • دو تەخت زمەرە گەرەكن • گەمیا مە پەرچە بو لێ بارام لسەر تەختەكی ما تاخوە گهاندە بەژێ •
ع ـ (اللوح ـ الواح) •

( تەرت )
كیستەكە • تەرتـــەك آخ دبارام وەركر ـ كیستەكەك تێ وەركر •
ع ـ (المدر) •

( تەشت )
ژ سفر چێدكن ـ ژ بافۆن ـ ئەلەمنیۆم چێدكن • تـێدە كنجا دشۆون ـ هەڤیردكن •
ع ـ (الطشت) •

( تەنشت )
بال ـ با ـ رەخ ـ جەم ـ آلی ـ لایی • لێ دبي بداخـــوازا (كیلـەك) بێتر هاتبـــي • (تەنشت) هـــەردو آلیـــێ مرۆڤن ـ هەردو آلیـــێ تشتن ـ راست وچەپێ مرۆڤ وتشتن •
ع ـ (الجنب) •

( تەورات )
ناڤێ نڤشتا موسی پەیغامبـــەره تەورات ـ انجیل ـ فورقان •
ع ـ (كتاب نبی موسی) •

( تەورات )
گوندەكە • لناڤ كیكایە • ل ژێـرێ بازارێ ( دەربێسي ) دكەڤي •
ع ـ (اسم قریة) •

## ( ته ـ س )

( تەرس )
ئەوتشتێ پیس كۆ ژ كـــەر وڤاتر وهەسپا دەر د كەڤـــي ـ سەركولە • سەرگـــین ئێدەوارا نە • پشكول ئـــێ پەزو دەڤانە •
ع ـ (الروث) •

( تەرەس )
ژتركی هاتیـــە • مرۆڤێ بێ ناموسە • دبـــي ژ (تعریص) چوبي تركی وپاشێ هاتبـــي كوردی •
ع ـ (من التعریص) •

( تەنەس )
لیزەكە ئەوروبي یە • بویـــە تەڤایی بتەختـــكا لگۆكێ دخن •
ع ـ (معروف) •

( تەلەس )
نزانم ژچه ، ژكو هاتيه ؟ لـێ
بداخـــوازا سەرخوەشـــێ
شەرپەزەيە •
جزيرى دبێژي :
مەست وخمار وتەلەسم ئەز••
ع ـ ( السكير الذى فقد قوتـه
وعقله) •

## ( ته ـ خ )

( تەخ )
گۆتنەكە دەنگييە • ژگـــا
وگاميشا رە تێ گۆتن • تـەخ
بەلەكۆ ! تەخ بەشۆ ! تـــەخ
چێلێ ! يانـــى فەگـــەرە ـ
بپاشدە هەرە • بشـــوندە
هەرە •
ع ـ (التراجع) •

( تەباخ )
نافێ مها هافينا پاشىيە •

( تەرخ )
بێشا سەر پەز ورەز و وەرزا
يە • بگومان وتەخمين تافێژن
سەر وان • رەزێ بارام سەد
درهەم لسەر • پەزێ شێرۆ
سێ سەد درهەم لســـــەر •
وەرزێ زۆرۆ چل دەرهـــەم
لسەر •••
ع ـ (التخمين او ضريبـــة
التخمين) •

( تەلخ )
تال ـ تەحلە • جزيـــــرى
دبێژى :ـ ( قەهوەيا (تەلخێ)
دگەل زهرا هلاهل بدە من )
ژفارســـي هاتيـــە • فارس
دبێژن :ـ صبر تەلخەســـت
اما بەرێ شێرين دارەد • صبر
تەحلە بەلێ بەرێ شێريـــن
ددى)

## ( ته ـ ز )

( تەرز )
آوايە • بڤى تەرزى ئەم كارن
خوە ژدەستێ دژمن بپارێزن ـ
بڤى آوايي • ملاخليلـــــێ
سێرتي دبێژى :ـ
لسەر زادێ رونە بتـــرز
وادب پيێ راستێ راكـــە ۆ
رازێنە چەپ •
ع ـ (الاسلوب ـ القاعدة) •

( تەفتەناز )

گوندەکە • لناف بەرا(حلب) و (حما) یە • ژکوردی هاتیە• (تەڤدە نازە) یا (تەڤ تنـازە) دیاپێشی دە ( تەڤـدە نازە ) ـ گەلـەك خوەش ونازدارە • دیا پاشـــــیدە (تەڤتناز) ـ بداخوازا :ـ تەڤلاڤـــردي وحەنەك وتنازە •

ع ـ (اسم قرية)

( تەنز )

باژارەکی کوردە ـ (تەنزێ) لناف بەرا بۆتا وخەرزا یە • دەرباس بویە •

( تەموز )

نافێ مەها هاڤینا نافێ یـــــە • دچاردەهێ تەموزێ دە دەستور ورستا وەلاتێ عراقێ هاتـــە گوهەرتن • شورشا لەشکـــر رستا قرالپەرستي بجارەك ونداکر • بسەرداریا عبـــد الکریـم قاسـم ســــەرداریێ لەشکـــرێ عراق ئــــەڤ لەپهلانێن چێبو •

ع ـ (الشهر الثاني مـــــن الصيف) •

( تەوز )

دبێژن : ـ تری تەوزیـــــە ـ گهایە کمالا خوە • تەوزاندن ـ یا (تەوز) گهاشتنا بـــەرێ مێوەیە • :ـ تریتوزیـــە ، سێڤ تەوزینە • هنجـــاس تەوزینە • هرمیتەوزينە :ـ دلبەر سبەهێ رابو ژخـەو زو تەوزی • ناکا لخوە پێچانـــە علێمی وتەمەزی •

ع ـ (الكمال في اعلى مراحلها)

( تەورێز )

باژارەکـــە ـ شارەکـــە • لرارۆژێ ایران ـ رۆژهلاتێ ژۆرێ کوردستانا ایرانـــە • پايتەختا آزەربایجانە • فارس دبێژن : (تەبریز) • لێ دبـي تەورێز ـ تەورەز ـ تەڤرەز بي •

ع ـ (مدينة بشمال ايران) •

## ( ته ـ ر )

( تەر )
لهەمبەر هشکە ـ وشـکە •
دبێژن :ـ تەرە ـ یانـــی
نەهشکە • جوانە ـ تەرحە •
ژعربي هاتیە • (تەراوەتـە) ـ
دارێ تەر + دارێ هشـــك
دهەمبە رهەڤ دەتێن • ئـەڤ
تەرە ـ یانی هێ هشكنــــە
بویە ـ هێ (طراوت) تـێدە
مایە •
ع ـ (الطراوة) •

( تەرەکتۆر )
ئەوریپییە • جۆتکارە ـ آلاڤێ
جۆتە •

( تەتەر )
ناڤێ مرۆڤەکی یە • دبـــي
ژ (تەتار ـ تاتار ـ) هاتبـي •
(تەتار) ناڤێ مللەتەکی ترکـە
لناڤ مەغۆلا :ـ
(زەنجیرێ نظامـــا تەتـــەری
زەندێ تە پێچان ۆ تو گرتـي
:ـ دڤێ شعرێ دە داخـــواز
(نظاما تەتەری) نظاما ترکیـــا
کمالی یە کولزەندێ مللەتـێ
کوردهاتیە راپێچان •
ع ـ (اسم شعب ترکی واســم
رجل)

( تەختور )
دەکتورە ـ پێزانە ـ بژیشکە
ع ـ (الطبیب) •

( تەڤر )
تەبەرە • آلاڤەکی جەنگێیە •
لێ نها بویە آلاڤێ کـــۆلان
وڤەدانـــێ • بچوکـــێ وی
(تەڤرکە) ـ دبي ژ دەڤرك
هاتبي • یانی هەر دو دەڤـێ
وی رکێ هەڤن بعەکســـا
هەڤن • براستی (دەڤرکە) •
ع ( القدوم ذات الحدین) •

( تەلێر )
قەلەوبون ومەزنبونا زکە :ـ
بارام زكتەلێرە زکمەزنە ـ
زکقەلەوە •
ع ـ (ابو الکرش) •

( تەمبۆر )
نـــاڤێ جیکی ژ گونـــدێ

( هسار )ه

ع ـ ( اسم مكان ) •

**( تەمبور )**

آلافەكى سـازبەندىيە • دكوردستانێدە ناڤـداره • خەلكێ چيـايێ ( دێرسم ) گەلەك تەمبـورڤان ژوان دەردكەڤن •

ع ـ ( آلة موسيقية ) •

**( تەمەر )**

ناڤێ مرۆڤـەكيـە • دبي ژ ( تەيمور ) ياژ ( تەمر ) ـ خورمە هاتبي • هن دبێژن :ـ ( تەمر ) • مالا ( تەمر ) پاشا زەنـگۆ زێرين لجزيرێ ناڤدارن •

ع ـ ( اسم رجل مشهور ) •

**( تەتەر )**

ناڤێ ملەلەتێ ( تاتار )ە ـ ناڤێ مرۆڤەكىيە •

**( تەنور )**

عربيىيه • لێ بويه كوردى • يان كورديىيه بويـه عربي • ژبەركۆ ژڤێ گۆتنێ پێڤـه دعربيىدە پەيدانابي • هـن دبێـژن : ـ ( تـەندور ) ئەگـەر وابي ژ ( تينِدور ) هاتيه • تينـا آگرێ وێ دور دچێ • ع ـ ( معروف ) •

**( تەيار )**

لبەر گونده • زەڤيـەكە • تەيارا مه لبەر گونـده • تەيارا مه گەلەك مەزنـه • ڤێ تەيارێ ژخووره بكره •

ع ـ ( قطعة أرض قريبـة للقرية ) •

**( تەيمور )**

ناڤێ ( تەيمورلەنگە ) ناڤداره• وەلاتێ كوردستانێ وەكـه رۆژهلات ژدەستێ وى زۆر وتالاني وكوشتن و شـەوات گەلەك دىيە •

ع ـ ( مشهور ) •

**( تەوار )**

ناڤێ آغـاكى اێزيدىايــه • چيرۆكێ كورمانجـا لسـەر هەنـه •

دبي ژتەڤآر هاتبي •
یان ئێ كۆ دتەورێني •

ع ـ ( اسم زعيم يەزدی ) •

**( تەور )**

بداخوازا ( بجارەك ) • دبێژن :ـ ئەگەر بارام نەچي ( تەور ) ئەز ناچم ـ یانی بجارەك ئەز ناچم • هن دبێژن :ـ ( تۆر ) لێ دڤردە داخوازەكە دی خویا دكي • ژبۆ آگاهداری‌یە :ـ تۆر پازدە زێرێ م لتەمانە • تۆر ئەز رازی‌مە تو نەرازیە ؟

ع ـ ( بالمرة ) •

## ( ته ـ ش )

**( تەبەش )**

ناڤێ گوندەكی لژێرێ ( دەرباسي ) دكەڤي •

ع ـ ( قرية ) •

**( تەحتەبەش )**

گوندەكە ، یا كافلەكی‌وێرانە • لژۆرێ بازارێ ( آمودە ) ول رۆژهلاتێ شارەوێرانێ ( دارێ ) دكەڤی • چیرۆكا :ـ( آخ تەحتەبەش ) لوەلاتێ مە ناڤدارە •

ع ـ ( اسم لمكان ) •

**( تەخبەش )**

یا تەخبەشۆ ! دەرباس بویە •
ناڤێ لیزەكە زارۆكایە •
بداخوازا ڤەگەرە •

ع ـ ( اسم لعبة للاولاد ) •

**( تەرش )**

ژسەوال وپەزرە تێ گۆتن• دبێژن :ـ دژمنا تەرش وتالانێ مە برن • ترشێ گۆند ژچارپێ رە تێ گۆتن •

ع ـ ( يقال لذوات اربع قوائم)

**( تەریش )**

پەرچەیەك زراڤ ودرێژە • دبێژن :ـ تەریشەك نان

بدە من • تەريشێ كراسێ خوە نابێني ؟ تيش ، تەليش ، تەريش بگر بداخوازەكێ تێن • لێ هەريەك لجيكي تێ گۆتن •

ع ـ ( بمعنى الوصلة ) •

( تەڤش )

كەڤرەكە پانە زارۆك پێ دليزن • هن دبێژن : ( لاك ) •

ع ـ (حجر في لعبة الاولاد )•

( تەلاش )

و ( تەليش ) بداخوازا پەرچە تێن • لێ گەرەكە ژدارا بن• دبێژن :ـ تەلاشەك داربدە من ـ تەليشەك دار بدە من !

پەرچاك دارە لێ دبي هاتبي چراندن لسەر درێژاهي •

ع ـ ( قطعة من الاخشاب ) •

( تەواش )

ژبۆ رون وقەلي وگوشت رە تێ گۆتن • بێ تەواشە ـ بێدوهنە •

ع ـ ( الدهون ) •

( تەوش )

بێفيدە ـ بێخيرە • دبێژن :ـ ئەڤ گۆتەكە تەوشە • بێداخوازە ـ بێكارە ـ بێ فيدەيە •

ع ـ ( بلا معنى ـ بدون فائدة)

## ( تە ـ ف )

( تەڤ )

نافێ گوندەكي يە • دبێژن :ـ چومە ( تەفێ ) ژ ( تەفێ ) تێم • بارام ژگوندێ (تەفێ ) يە • ع ـ ( قرية ) •

( تەوف )

ژدارا لسەر آڤێ چەما بەر بژێر دچي • دبي ژعربي

هاتبي • كورد داريْ خوه يا بازرگانيا خوه لسه‌ر چه‌مێ دياربه‌كه‌ر به‌ر بموسل ڤه دبن •

**( ته‌ڤ )**
بداخوازا ( هه‌مى ) هاتيه • ته‌ڤ وه‌رن ـ هه‌مى وه‌رن • ژوه ته‌ڤا ره دبێژم ـ ژوه هه‌موا ره دبێژم •
ع ـ ( مجموع ) جملة ـ كل

## ( ته ـ ق )

**( ته‌ق )**
ده‌نگه • ده‌ما تشته‌ك ل تشته‌كى دكه‌ڤي ده‌نگ ژێ تێ • ژڤي ده‌نگي ره تێ گۆتن :ـ ( ته‌ق ) ـ ته‌قين ـ ته‌رقين •
ع ـ ( كلمة صوتية ) •

**( ته‌ق‌ته‌ق )**
وه‌كه ( ته‌قه ) لێ چه ده‌ما دو جار دبێ ( ته‌ق‌ته‌ق ) دبێژن :ـ ته‌قته‌ق ژده‌رێ مه تێ • يانى هنك ده‌ستێ خوه ،

يا تشته‌كى لێ ددن •
ع ـ ( كلمة صوتية ) •

**( ته‌قتاق )**
داره‌كى كونكرى زارۆك پێ به‌ركا دته‌قينن • به‌ركێ گولشلاڤێ لوه‌لاتێ مه ژبۆ ڤي آوايي بكار دهاتن • وه‌كه ده‌ستكێ ميشكوزێ تێ به‌ر چاڤێ من • ( ••••• ) •

**( ته‌رق )**
وه‌كه ( ته‌ق ) تێ گۆتن • بارام گۆ ته‌رق وده‌مانچه به‌ردا سه‌رێ وى ••
ع ـ ( كلمة صوتية ) •

**( ته‌قتوق )**
تشتێ كڤناره‌نه •

**( ته‌لاق )**
( طلاق ) ژعربي هاتيه • ژن‌به‌ردانه •

**( ته‌لق )**
زۆخ وگه‌مار وقه‌رێژا پاش زيا به‌رخ و كارا يه • به‌رى كۆ ببي پشكول ناڤێ وێ

( تەڤقە ) تەڤق بداويا كارا مە ڤەهشك بويە • تەلقا وێ بەرخێ ـ وێ كارێ پاقژ كەە•
ع ـ ( ••• ) •

## ( ته ـ ك )

**( تەك )**
نافێ دەمانچێ یە • وا دیارە كۆ ژدومانچا یەكدەرب رە تێ گۆتن • كوردێ شامێ دبێژن :ـ هەلا ( تەكا ) من بینە ! یانی دومانچا من بینە •
ع ـ ( الورور ـ مسدس ) •

**( تەك )**
یەكە • دبي ژتركی هاتبي • كورد دبێژن :ـ ( تەك وجفت ) ـ ( یەك وجۆت )
ع ـ ( الفرد ـ مفرد ) •

**( تەپك )**
دلیزێ دە ژهری وپرچا دەڤا چیدكن وپێ دلیزن • دشەواتێ دە ژریخ وسەرگین وسەركولا. چێدكن وخەلكێ بەری ودەشتا دشەوتینن •
ع ـ ( الطابة في اللعبة ) •

**( تەوك )**
شف وداركێ تەرن كۆ ددن بەر آگرێ خوە • لرازۆرێ كوردستانێ ولۆ دبێژن • ئەم دبێژن :ـ ( شفتەرك ) •
ع ـ ( الاغصان الطرية ) ـ ( الرطبة ) •

**( تەشك )**
ژچیما رە تێ گۆتن • دبێژن: تو لتەشكێ وی ! تەشكێ وی لهەف دحەربلن • بارام تەشكخوارە چیمخوارە • ژبۆ كیماسیەیە • ژچیمێ كەرا رە تێ گۆتن • كەرێ وە تەشكێ وی خوارن •
ع ـ ( تستعمل بصورة استهزائية للسيقان ) •

**( تەشك )**
نافێ ملەلەتەكی یە • ( تەشكوسلوفاك ) ایرۆ نافێ دەولەتەكێ نە • دیارە كۆ ژدو ملەلەتا بهەڤە هاتیە گرێدان • ( چەكوسلوفاكە ) لێ عرب ( ت ش ) جارنا

لشونا ( چ ) دبێژن •
ع ـ (تشكوسلوفاكيا) •

( تەڤنك )
بچوكێ ( تەڤنـــه ) پیرێ ـ ( عنكبوت ) لدارا تەڤنكێ چێ دكي • ئـــــەم دبێژن :ـ ( تەڤنكاپیرێ ) •
ع ـ ( عش العنكبوت ) •

( تەڤزینۆك )
بلاشێ مرۆڤ فەتێن •

( تەڤرك )
بچوكێ تــــەڤره • دەرباس بویە •

( تەنك )
دهەمبەر قالن ـ ســـتور دە هاتیە • نان تەنكه ـ نەقالنه ـ نەستوره •

( تەنەك )
تەنەكه • وەكه بافۆنه • ژبـۆ گــــاز ودمس ورون ••• بكارتێ •
ع ـ ( الصفيحة ) •

( تەنگ )
دهەمبەر فرەه دە هاتیـــه • تفنگا من دەف تەنگه • بـەر ناچي سەر • خانيێ مـــــه تەنگه ـ نەفرەهه • بهنا بارام تەنگه ـ نەفرەهه •
ع ـ ( الضيق ) •

( تەیرۆك )
ئەو زیپك وبارانا كۆ وەكـــه طەیرا خـــورت وبتێن تێ نافێ وێ :ـ تەیرۆكه ـ طیرۆكه •
ع ـ ( الامطار المزيجـــــــة بالحالوب ) •

## ( ته ـ ل )

( تەل )
رەخه ـ آلی یه ـ دهێـكێ دە خويا دكی : سەر ـ بن ـ تەل • تەلێ هێكێ رەخێ وێیه • هەر وەها ( تـەل ) بداخوازا رەخ ژهەر تشـــــتی تێ • دبێژن :ـ بارام خوه لتـــەلێ فەرهاد دخي •
ع ـ ( الجانب ) •

( تەرقال )
دبێژن :ـ بارام بتــــــەرقالا

فه‌رهاد كه‌تيه • يانى خـــوه
دكي هـــــه‌فـانێ وى ـ پێره
دكه‌رى خوه وه‌كه وى دكى •
هه‌ڤالتيا مرۆڤێ نه‌باشه •
ع ـ ( مصاحبة رجل السوء )

**( ته‌قل )**

وه‌شه • ته‌قله‌كه دى بـــده
خوه ـ وه‌شه كه دى بده‌خوه
من ته‌قله‌ك دايێ ـ وه‌شه‌ك
دايێ • دبێژن :ـ بــــارام
فه‌رهاد دابه‌ر ته‌قـــلا • يانى
دابه‌ر وه‌شا •
ع ـ ( الهزة ) •

**( ته‌قل‌به‌قل )**

گونده‌كه كۆ دكه‌ڤى سينۆرێ
كوردستانا سوريه وعراقێ •
ع ـ ( قرية ) •

**( ته‌مبه‌ل )**

مرۆڤێ كۆ كار پێ نابي ، يـا
ناخـــوازى كـــار بكى •
( ته‌مبه‌لي ) ژێده‌رێ وێ يـه
هن دبێژن ( ته‌مه‌ل ) •
ع ـ ( الـكسول ) •

**( ته‌نگال )**

كێله‌كه ـ ته‌نشته • دبێژن :ـ
بارام بـ‌ته‌نگالا فه‌رهاد كه‌تيه ـ
دايه كێله‌كا وى ـ دايه ته‌نشت
وى • برەخ كتيه • بويه هه‌ڤالێ
وى • خه‌نجه‌ره‌ك خســـتيه
به‌ر ته‌نگالا خوه ـ خستيه به‌ر
ته‌نشتا خوه •
ع ـ ( خاصرة ) •

**( ته‌ول )**

جهێ خوه‌دى‌كرن وگرێدانـا
هه‌سپا يه • كورمانج ژمه‌زنێ
خوه‌ره دبێژن :ـ ئه‌زبـه‌نى !
مالا من ته‌ولا هه‌سپێ ته يه •
ع ـ ( المربط ) •

**( ته‌رم )**

لاشێ مرى‌يـــه • دبێژن :ـ
وه‌رن ڤي تـه‌رمي راكن ـ ڤى
لاشي راكن •
( ته‌رمێ‌مــــه‌خيل ) يـــان
( ته‌رمێ مه‌خينا )
چه‌ند ستێرن ل‌ئازمانا گۆيا :ـ
مرۆڤه‌ك مرى‌يـه ودێ وژن
وخوشـــــك ل‌پەى دچن

گۆرنستانی •

ع ـ ( النعش ) •

دەهم ـ سەمت ـ دەر ـ شون

( تەرام )

لناڤ شارێ گەورە ـ مـەزن لشونا ( ئۆتۆپێس ) ب کـارە یا ـ ئـــــەلەتریک دگرێنن ومرۆڤ لێ سوار دبي •

ع ـ ( تراموا ) •

( تەرم )

ناڤێ بازارەکی ـ شارەکی یە • لایران دکەڤي •

ع ـ ( مدینة ایرانیة ) •

( تەخم )

دەهەم ـسەمت ـ دەر ـ شون جی یە • دبێژن :ـ بارام لڤێ تەخمێ هات کوشتن ـ کوژرا یانی لڤێ دەهمێ لڤێ سەمتێ ـ لڤێ دەرێ •

ع ـ ( السمت ) •

( تەن )

لاشە • کورد وفارس دڤردە بەمیارن • بەلام کورد جارنـا ( تەن ) ژ پاشـــیا مرۆڤا رە

دبێژن :ـ پزکك دهنـدروێ تەنا بارام دە هاتیە •

ع ـ ( دبر ) ـ جسم •

( تەپین )

دەنگێ لێدانا دەستە • هــن دبێژن :ـ ( تـــــەرپین ) • دشکاندنا هێکێ دە ( تەپ ) یا ( پت ) دەنگێ شـــکەنێیە • ( تەپین ) ژێ نەهـــات یانی بێدەنگ شکەست • گۆ تەپ وشکەست• تەپ تەپ ژ ناڤدلێ من تێ • ( تیپ ) بـــداخوازا حەرف ژڤرهاتیە •

ع ـ (کلمة صوتیة عامة) •

( تەپاندن )

یا ( تەپ تەپاندن ) ئەوە کـۆ ژن دەستێ خوە لپێچــــەکا زاروك ـ مندالێ خــوە بدی ودەنگێ ( تــەپ ) ژێ بێ • جارنا ژبۆ لێدان ژێ‌تێ •

ع ـ ( الضرب ) •

( تەرابون )

کەتنە • لێ کەتنا ژ زۆردەیە• بارام دخانی تـەرابو ـ دبیرێ

تەرابو • دچی‌یێ تەرابو •
ع ـ ( الوقوع من الاعلى ) •

**( تەراکرن )**
تێ‌پەرە • ئەوە کۆ یــــەک یەکی یا تشــــتەکي ژ ژۆر دە ترا بکي ـ بــەردی • بارام ژ چي‌یێ هیمەک تــەرا کر ـ بەردا • آڤێت •
ع ـ ( الاقاع ) من اوقع الشيء

**( تەرپلاندن )**
ئەوە کۆ پێ‌یێ مرۆڤ لتشتەکی بکەڤي ومرۆڤ پێ‌رە بلکومي •
ع ـ ( العثرة ) •

**( تەرەدین )**
یا ( ترەدین ) ئــەو مرۆڤێ تەوتەوەیە دبي ژ ( تەرزەدین) هاتبي • وەکە دینایە • یــــا ئەو دینێ کۆ خوە ( تــەرا ) دکی •
ع ـ ( خفیف العقل ) •

**( تەرەزان )**
ناڤێ گەرناسێ چیرۆکێ‌یــە کۆ لناڤ مێشە خوەدی بویە- مەزن بویە • مرۆڤێ هۆڤ •

ع ـ ( معروف ) •

**( تەرابزون )**
ناڤێ بازارەکی- شارەکي لبەر دەریا رەشە • خــەلکێ وێ ( لازن )دبن دەســتێ ترکادە وەکە مە دژین •
ع ـ ( مدینة ترکیة ) •

**( تەڤن )**
ناڤدارە • ع ـ ( انحیاکة )•

**( تەڤزین )**
یا تەڤزینۆک• دلاشێ جاندارد چی‌دبن • بێ‌وەکو خــون ڤەگەری جهێ خــوە لاش ، ئەودەر دتەڤزی • یـــان ژ نشکاڤە لاشێ مرۆڤا دهەژی • دبێژن :ـ نگێ من تەڤزیــە ـ خون ڤەدگەری شونا خــوە • تەڤزی ـ یا تەڤزینۆک تێنــە لاشێ من • گلک جارا بەری ( تایێ ـ مەلاریا ) چێ دبن • دەرباس‌بویە •
ع ـ ( اهتزاز في الجسم ) •

**( تەڤزاندن )**
تێ‌پەرە • بداخوازا کەشتنە •

بارام فەرهاد تەڤزاند ـ کوشت
ع ـ ( تأتي بمعنى القتل ) •

**( تەڤزاندن )**
یا بەڤزین • بـداخوازا گلك
سار ـ سارکرن هاتیە •٠آڤـا
تەز ـ تەڤزی ـ گلك سارە •
ع ـ ( البرودة ) •

**( تەڤرزین )**
آلاڤەکی کەڤنە ژبـۆ جەنگ
وشەرە • وا خویایە ـ دیارە•
( تەڤرە ) لێ ژبەرکو سـوارا
دخستن بەر زینێ هەسپێ خوە
نافێ وی بویە • ( تەڤرزین )
ع ـ ( من اسـلحة الحرب
القدیمة ) •

**( تەقین )**
دەنگێ تفنگ وهەمو تشتێ کۆ
باروێ دپەقي • هـــــن
دبێژن :ـ ( تـــەرقین ) • لێ
تەرقین ژتەقین فـرەهـ تـــرە
ع ـ ( صوت الاسلحة الناریة)

**( تەقان )**
ماینا دنـــاف چرافێ دە ـ یان
بـخوە چرافە • دبێژن :ـ ئەز
کـــەتم نـــاف تـــەقانێ ـ
ناف‌چرافێ • ئەف‌دەر تەقانە ـ
چرافـــە •
ع ـ ( المستنقعة ) •

**( تەقن )**
مقدارە • دبێژن :ـ تەقنـەکی
چوم ـ مقدارەك چوم • تەقنـەك
خوار ـ مقدارەك خوار •
ع ـ ( المقدار ) •

**( تەمین )**
دبي ژ ( تنبیـــە ) هـــاتبي •
دبێژن :ـ تەمێنيیا من ل‌بارا
بکە بەرە بریدە ل‌من مقاتـــە
بي • یـــانی ( تنبیها ) من لێ
بکە • دستران وبەســـــتەدە
هاتیە :
بەســـتە
تـــــەمێنيیا م ل تـەبێ
تول نەرینێ مقاتەبێ•••

**( تەواندن )**
تێبەرێ ( تەوین ) ە • دەمـا
مرۆڤــــەك سترانـەك ـ
گۆرانی یـــەك دبێژی یەکی
دی ژێرە دتـــەوێني • یانی

دبێژی :ـ تەوتەو •

**( تەواندن )**
قەلەو • ژعربي هاتیە ( طوی )
دبێژن :ـ ڤێداري بـتەوینە •
سەرێ خوە ژکەسرە ناتەوێنم
ـ خوار ناکم •
ع ـ (　　　)

**( تەو )**
دەرباس بویە • د ( تەواندن )
دە هاتیە زانین •
ع ـ ( ••• )

**( تەو )**
ڤالن • ڤاتە • چار تەو ـ چار
ڤاتە • دو تەو ســێ تەو •••
تەوەك • دجاو دە خویـــا
دکي • دۆشەك دو تـەوە ـ
دو بەرە • متێـل دو تـەوە ـ
دورویە • ئەڤ جاو دو تەوە
ـ دو بەرە •
ع ـ ( الوجە ) في الاقمشة •

**( تەواو )**
ســــۆرانی یە • بداخوازا
( تەمـــامە ) ( تمام )• ژعربي
هاتیە •

ع ـ ( تمـــام ) •

**( تەي )**
ناڤێ ائێلەکە کوردە کۆچەرە•
وەهارەنگە ناڤێ ائێلەکە عربـە
لژێرێ ( ڤامشلو ) دکـەڤی •
لناڤ عربا ئەڤ ائێل ناڤدارە •
( حاتـەم ) ژڤێ ایلێیە • لێ
( تەی ) ئێ کورد نەژڤێ ائێلێ
نە • کۆچەرێ میرانە •
ع ـ ( عشيرة عربية وعشـيرة
کردية ) •

## ( ت ـ آ )

**( تکا )**
بـسۆراتی بداخوازا هێڤی یە
تکا ئەکم ـ هێڤی دکم •
ع ـ ( رجاء ) •

**( تکا )**
بکورمانجي بداخوازا ( چکا )
یــە • دبێژن :ـ تـکاوی نانی
بێنە ! ـ چکا وی نانی بێنە •
جا کا وی نانی بێنە • سا وی
نانی بێنە • بـسۆرانی ( ســا )
( دەسا ) شونا ( تکا ) و (چکا)
دگرن • ع ـ ( ••• )

**( تیا )**
یا ( تیاْ ) بداخوازا ( غینەت )
هاتیه • دبێژن :ـ تیا ! بـــارام
نەستێله بو زو هات کوشتن •
( مخابن ) شونا وێ دگري •
ع ـ ( تـــدل على الحســـرة
والغبن ) •

## ( ت ـ ئه )

**( ترمه )**
آخەبانه • کورد کۆ دچـــن
حجـــازێ دچن ( حجێ )
لشونا شـــاشپیچانا خـــوه
وەردگرن ـ لسەرێ خـــوه
دپێچن • رەنگێ وێ زەره •
ع ـ ( ••• )

**( تژه )**
یان تشـــــه • بداخـــوازا
( داگرتی ) یـــه • دبێژن :ـ
تاس ( تژه ) آفه • چـــەوال
تژه گەنمه • ڤێ چاپێ ژمەره
تژه بکه •
ع ـ ( مليیء )

**( تنـــه )**
یان ( تونه ) • بداخوازا نینه ـ
نیه • هاتیه • خەلکێ موسلێ
ژ کورمانجێ وەلاتێ مـــەره
دبێژن :ـ اهل‌تنه •
ع ـ ( ماکو ـ مافي ) •

## ( ت ـ ئێ )

**( ترکێ )**
نافێ گوندەکی لناف سلیڤایه
وەها رەنگه نافێ ژنایه • هـــن
ژبۆ ژنا ژشـــیرانی دبێژن :ـ
( ترکۆ ) • چاوا کـــۆ کورد
ژ دژمنا هيژملەتێ ( ترک )
ره دبێژن :ـ ترکۆ •
ع ـ ( قرية ) •

**( تڤێ )**
بەهدینـــــا لشـــونا ( دڤێ )
بداخوازا گـــەرەکه دبێژن :ـ
( تڤێ ) •　ع ـ ( يجب ) •

**( تلێ )**
نافێ گوندەکی لناف بوتایـــه•
ئـــەف گوند بچێـــــکرنا
( شالوشاپا ) نافداره •
ع ـ ( قرية ) •

**( تنێ )**
هن کورمانج لشونا ( تەنێ ـ
تەنیا ـ تەنها ) تنێ دبێژن •

ع ـ ( وحده ) •

## ( ت ـ يى )

**( تي )**
ئەڤ مرۆڤێ تهني يه • تي‌بويه
بێ‌آڤ مايه •
ع ـ ( العطشان ) •

**( تي )**
برايێ مێرێ ژنێ يه • ژنـا
بارام ژبرايێ وى ره دبێژى:ـ
تي‌يێ منـــه • يـــانى برايێ
مێرێ وێ يه •
ع ـ ( أخ زوج المرأة ) •

**( تي )**
تەنێ • بداخوازا ( تـَه ) تۆ
هاتيه • ايزيدى دبێژن :ـ پـا
بشـــيخ‌هادى تي‌جامێرى تي
باشي ـ تي چـــاكي • يـانى
( تۆ ـ تو ) چـاكي ـ باشـــي
ع ـ ( انت ) •

**( تبي )**
بداخوازا تۆبي • لێ دڤـرده
( بي ) جياوازه • دبي كــۆ
ژكرنا بو كۆ ژێـــدەرێ وێ
( بونه ) هاتبي • تە نيـــــا
بداخوازا ( تۆ ) هاتيه • (تبي)
بڤى آوايى پەيڤەكە نەگوتنەكە
ع ـ ( انت تكون هكذا ) •

**( تسي )**
بداخوازا ( روت ) ـ تەنيـا ـ
تەنها هاتيه • دبێژن :ـ ئـــەز
نانێ ب(تسي) دخـــوم ـ يانى
نانێ بێ‌خوارن ـ نانێ كــــۆ
تشتەك دگەل نەبي ـ نـانى
تەنيا ـ تەنها دخوم •
ع ـ ( المجرد ) •

**( ترى )**
ناڤداره • گلك ترى هەنه :ـ
مەزرۆنه ، گـــەوره ، زەيتى ،
حەسەنى ، بەنگى ، سفنك ،
كۆخەر ، كەركوش ، ••
ع ـ ( العنب ) •

**( تژى )**
وەكـــه ( تژه ) تێ گۆتن •
دەرباس‌بويه تژى بويـــــه ـ
تژەبويه •

**( تزبي )**
دەروێش بدەستێ خوه دگرن
وەردێ خوه پێ دكشـــێنن •

بويه تەڤايي •

ع ( المسبحة ) •

**( تفي )**

يا ( تفو ) ژبۆ غەيد ولاتە •

ع ـ ( اللعنة ) •

**( تلي )**

دهەر دەستەكى دە ( ٥ ) تلي هەنە • چارنا شەش تلي چێ دبـن • دنـاڤ تلي‌يێدە پێچى هەنە • تليا گردێ دو پێچى لێ ئێ مايى سێ پێچى‌نە •

ع ـ ( الاصابع ) •

**( تمي )**

بداخـوازا ( تم ) هـاتيە هەردەمە • بـارام تمي ولۆ دكي ـ هەردەم ولـۆ دكي • بارام ! تمي كارێ تـە ئەڤە •

ع ـ ( دائمـا ) •

**( توى )**

بداخوازا ( تۆيى )• دبێژن :ـ ئێ كۆ ئەڤ ايش كريـە بارام ! توى • ع ـ ( انت ) •

( يى ) ژبو بجيـكرنە • تەڤگەرەكە لداويـا گلك ناڤا تێ ••• ؟

## ( ت ـ ئۆ )

**( تبۆ )**

ناڤێ مالباتەكى ل( عامودێ )يە بناڤێ ديا خوە ، ناڤدەنگێ ديـ خوە دەنگ دانـە دبێژن :ـ ( مالا تبۆ ) ناڤێ ديا وان نـە تبويە لێ ولۆ دەنگ دايە •

ع ـ ( اسم عائلة ) •

**( ترۆ )**

ژمرۆڤێ دەرەوين رە تێ گۆتن• دگۆكـا خوەدە ئێ كۆ گلك ترا دكي • لێ پاشێ بويـە ناڤێ ئێ كۆ گلك دەروا دكى دبێژن :ـ دەهـەرە لۆ ترۆ ! يانى دەهەرە دەرەوينۆ ! •

ع ـ ( اسم للكذاب ) •

**( تشۆ )**

ژبۆ بانگا كەرايە • دبێژن :ـ تشۆ ! يانى وەرە كـەرۆ ! لبەيى هەڤ تێ گۆتن • •••

ع ـ ( كلمة صوتية يقـال للحمير ) •

**( تلو )**
ناڤێ گوندەکی‌یە لناف بۆتایە خەلکێ تلۆهەمی سنەتچی‌نە • ل ناف کوردستانی ولسوریا وعراقی ژی دگەرن • خوە ( سید ) دهەژمێرن • ژڤی گوندی ( سلطان ممدوح ) کتێبا ( زیل ) لسەر ( شەرەفنامێ) چێکریە • ئێ گلک جهێ آخینە کۆ بدەستێ من نەکتیە•
ع ـ ( قرية ) •

**( تخوب )**
سینۆرە • دبي ژتخوم هاتبي• دبێژن :ـ تخوبێ مە ئەڤ جهۆکە • یا ئەڤ گزیرە ••
ع ـ ( الحدود ) •

**( ترب )**
گۆرە • ئەڤ تربا بارامە ـ گۆرا بارامە • ( ترباسپي ) یا تربەسپی • گوندە لرۆژهلاتێ ( قامشلۆ ) دکەڤي ژبەرکۆ تربێ وی سپي‌بون ناڤێ وی بویە ( تربەسپي ) •

**( تل‌عقاب )**
یا ( تل عگاب ) • گرەکە • لناڤ ( ملا ) دکەڤی ژێرێ ( عامودێ ) •

( ت ـ پ )

**( تپ )**
یا ( تپ‌تپ ) • دەنگێ لێدانا دلە • دبێژن :ـ تپ‌تپ ژدلێ من تێ • لێ براستی ( تپ ) گۆتنەکە دەنگی‌یە ژهەر تشتی‌رە تێ گۆتن چەدەما تپین ژێ بێ • ( تپین ) ژێدەرێ وێ‌یە • گلک جاران دبێژن: تپین ژدلێ من تێ • درستە ( تیپ ) کۆ بداخوازا (حرف) هاتیە دانین ژڤر دەرکەتبي •
ع ـ ( صوت اضرب ) دقات القلب •

**( ترپ )**
یا ( تلپ ) • ئەو قەرێژ وگەمارا کۆ دکەڤي بن آڤێ• خەسما آ تري کۆ دکن ( دۆشاو ـ دمس ) دچاخێ کەلاندنێ‌دە دپارزێنن ( تلپ ) بين

دكەڤي ٠٠٠

ع ـ ( الاوســـاخ التي تتكوم

## ( ت ـ ت )

**( تت )**

يا ( تد ) ٠ بەردانا كوچكە ـ
بەردنا ســـگە تتتت ! يانى
ئۆشتە ـ هەرە ٠
ع ـ ( يقال في طرد الكلاب )

**( ترت )**

دەنگێ وی بـايێ كۆ ژ زكێ
جاندار تێدەر ٠　( ٠٠ )

**( تشت )**

بداخوازا ( شت ) دسۆرانى دە
تێ ٠ ڤىتشتى ژڤر راكـــە ٠
ئەم شتە لەائێرە رایێکە ٠
ع ـ ( الشيء ) ٠

**( تفت )**

هرى وپرچا دەڤـــايە ٠ ڤژى
حشترە ٠ كوم ـ كـــلاو ژڤێ
تفتێ چێ دكن ودبێژن: كومێ
تفتكي ٠ ع ـ ( الوبر ) ٠

**( تنات )**

گوندەكە لناڤ ئۆمەريـــــا
دكـــەڤي دڤى گونـــدى دە
هەڤيركا وئۆمەريا گلك مێر
ژهەڤ كۆشتنە ٠
ع ـ ( قريـــة ) ٠

**( تخاريس )**

دكراس دە پەرچاكە ٠

**( ترس )**

ترسين ژێـــدەرێ وێ يـــە ٠
تێنەپەرە ٠ ترساندن تێپەرە٠
ترســـــۆك ئێ كـــۆ گلك
دترسي ٠ ( ترسۆنەك ) ژى
ولۆيە ٠ ترســـينۆك ئێ كـــۆ
خەلكێ دترسێني ٠
ع ـ ( الخوف ) ٠

**( ترمس )**

( تينپارێزە ) ٠ ئێ كــــــــۆ
تين وقوەتا گەرم وسەرم دخوە
دە دپارێزي ٠ ئەورووپى يــە ٠
بكوردى ئـــەم كارن بێژن :ـ
( تينپارێز ) ٠
ع ـ ( ترمس ) ٠

**( تس )**

نان خوارنا روتە ٠ دبێژن :ـ
بارام نانێخوە بـتسي دخوى٠
يانى بێ تشتك ٠ ( ٠٠٠ )

( ترنج )
وەکە نارنج وپرتەقالـە • لێ
ب خافی نایێ خوارن •
ع ـ ( معروف ) •

( ترح )
ئەو شـــاخێ کۆ نو ژدارا ،
ژلەما ، ژ گەیا دکشن ، درێژ
دبن • بچوکێ وێ ترحکە •
ترحکا دارێ • ( ترحۆ ) نافێ
مرۆفەکی یە • ترحین • نـو
ترحا خوە دایە •
ع ـ ( الغصن ) •

( تلکەلەخ )
بازارەکی بچوکە لنافبەرا
بازارێ ( حمص ) و ( لازقي)
یێ دکـــەفي • دبێژن :ـ
نێزیکی دەھ ۱۰۰۰۰ کورد
دفی بازاریدە ھەنە •
ع ـ ( مدینة سوریة ) •

( تد )
دەرباس بویـــە ( تت )ە •
بەردانا کوچکێ یە • د دیوانا
من دە ھاتیە ( تد ) •
:ـ ژبەر دەر تـــد کرێ

دلبەر •••

( تناز )
پێکەنین وقەرف وحەنەکن •
دبێژن :ـ بارام تنازێ خـــوە
بفەرھاد دکی ـ پێ دکەنی ـ
حەنەکێ خوە پێ دکي •
ع ـ ( القرف ) الاستهزاء •

( تر )
آلافەکە • ژبۆ زێدەبـــون
ھاتیە :ـ بارام ژفەرھـاد چێ
( تر ) دخـــەبتی • بـــارام
ببەژنا خوە ژفەرھاد کنترە•
زێر ززیفـ بھاترە •
ع ـ یستعمل للتفضیل ) •

( تر )
نافێ وی بایێ کـــۆ ززکێ
جاندار تێ دەر ـ دچی دەر ـ
دەردکەفي • ( •• )

( تبار )
یا ( تبارە ) • ئەو بەرێ کـــۆ
پالە ددن بەر خوە دپالەیا جـە
وگەنم دە • دبێژن :ـ کەنمێ
مە تباراك مایە • یانی یەك
تبارە مایە ـ یەك بەر مایە •

ع ـ ( الوصلة في الحصاد )•

**( تجار )**

يانى ( بجـــاره‌ك ) ـ هيج
ده‌لين :ـ تجـــار دژمن نابن
دۆســت ـ بجـــاره‌ك ـ
جاريك • نابن دۆســـــت •
تجاري ـ تجارا ژى تێ گۆتن
( جار ) •
ع ـ ( مرة ) واحدة ( ابدا )•

**( تغـار )**

نافێ پيڤانه‌كى‌يه • وه‌كـــه
چه‌واله • دبێژن :ـ سه‌د تغار
زادێ من هه‌يه • لێ بهنـــا
تــــركي ژێ تێ • ل‌وه‌لاتێ
( دياربه‌كر ) ولۆ دبێژن •
ع ـ ( وزن تركي )
ـ على ما اعتقد ـ

**( تفر )**

وه‌كه شێلمه • په‌رچه په‌رچه
دكن ول به‌ر خوارنێ داتينن
ب‌خوارنێ‌ره دخون • تاما وێ
توژه • ع ـ (                )

**( تلور )**

ل‌پاش (ته‌ير) تێ گۆتن:ـته‌ير
وتلور وا دياره كۆ ( تيور )يێ
بويه ( تلور ) • لێ بداخوا‌ز
ته‌يرێ هور تێ • وه‌كه چوك
وچڤيـــك لێ چڤيـــك
ژچوك مه‌زنتره•هروه‌كو ته‌ير
ژتلور مه‌زن تره•بركێ هه‌ڤن•
ع ـ ( الطيور الصغيرة ) •

**( تش )**

زبۆ پێ‌كه‌نين وقـــه‌رفـه •
دبێژن :ـ تش ! وێ بـــار‌ه
ژمه‌ره وه‌لات ژده‌ستێ دژمن
پاريزي ؟ تش ! وێ فه‌رهه‌د
ژمه‌ره مه‌زناهي‌يێ بكى ؟•••
ع ـ ( لعدم الثقة والاستهزاء )

**( ترش )**

تامه‌كه • وه‌كه شۆر ، توژ ،
تال ، شێرين ، مزه •(ترشي)
ئه‌و تشتێ كـۆ ترش دكن •
ترشۆك نافێ گـه‌ياكى يه •
ترشۆ نافي مرۆڤـــه‌كى يه •
ترشك نافێ خوارنكێ يه •
ع ـ ( الحامض ) •

**( تف )**

ژده‌ڤێ خوه دافێژن ده‌رڤـه •

دبێژن :ـ بـــارام تف کره •
فەرهاد • کەف وکنجــا دەڤێ
خوه آڤێته ســەر چاڤێ وي •
ل‌شونا ( لانەت ـ لعنت ) تێ
گۆتن :ـ
( تفو بەرته ئەی چـــــەرخێ
گەران تفو ) •

ع ـ ( البزق واللعنة ) •

( تڤ )

دەنگێ گولەیـــــە • یا دەنگێ
هەمو تشتێ کۆ تڤن ژێ تێ•
تڤن ژێـــــدەرێ وی یـــە •
گۆتنێ دەنگي دکـــوردی ده
گلك خویا دکن •
ع ـ ( کلمة صوتیة للرصاص)

( تق )

یا ( تقتف ) کەنێ زێده یه •
دبێژن :ـ بو تقتقا کەنێ بارام•
( پرق ) ژي بڤێ داخـــوازێ
تێ :ـ گۆ پرق وکەنیا • ژن
ژزارۆکی بچوکەره دبێژن :ـ
تق ، تقـ ••• داکۆ بکەنن•
ع ـ ( الضحك والقهقهة ) •

( تکتك )
دەنگێ ژەندنا کڤانه • دبێژن:
بو تکتکا کەڤانێ رەوشــــێ •
وهارەنـــگه دگلك جهاده تێ
وەکه دەنـــگێ ( فرەآڤیزێ ـ
ترالۆزێ ) •
ع ـ ( کلمة صوتية ) •

( ترك )
دەنگێ شکەستنێ یه • دبێژن:
گۆ ترك وشکەشــــــــت •
ترکیني ژ کۆپي مه هات •
ع ـ ( صوت الكسرة ) •

( ترك )
ناڤێ ملەلەتەکی یه ژ چینێ تا
سنیۆرێ یەونان وبلقــــاردرێژ
بونه • هنـــك دژێرێ رۆژ
هلاتێ یەکتیا ســــــۆڤیاتی ده
دژی • تەنێ ملەلـــەتێ کورد
ناڤیرا ترکێ آزەربــــایجان
وترکێ ترکیا دبري • ژلەورا
ترکێ ( طوراني ) کمالیست
خستبونه دلێ خـــوه کــــۆ
ملەلەتێ کـــــورد بزۆر بکن
ترك • داوەکو ترکستانەکـــه

مەزن لـدارخن • لێ دقرنێ
(٢٠) بیستا ده ئـــەف داخواز
پێک نایێ • ژبـــەرکۆ زۆر
نەما بکارتێ • مللەت هەمـو
شیار بونه •

**( تفک )**

ژبەرکۆ هەرکەسي تفا خـوە
تافێته آگر دانێ نافێ وێ بویه
تفـک ـ جهێ ( تفێ ) • لێ
( آگردان ) راسته • ژبەرکۆ
جهێ آگره • نەجهێ تفێ‌یه •
ع ـ ( الموقد ) •

**( تمک )**

بچوکێ ( تمه ) تلمه ـ تله •
دبێژن :ـ بارام لســـــەر فێ
تمکي رونشتیه • یا لەسەر فێ
تلمکي رونشتـــیه • ژتــل
بچوک تره •
ع ـ ( المرتفع ) •

**( تنک )**

سەرگۆ یه • بارام لســــەر
تنک رونشتي یـه ـ لســـەر
سەرکۆ روتنشتي یـه • تنگێ
دەرەوا ل‌گوندێ ( تلشعیرێ )
ب ناف ودەنگه •
ع ـ ( المزبلة ) •

**( تنگ )**

قەلـــەو • دەنگي یه • تنگین
ژێدەرێ وێ یه •
ع ـ ( کلمة صوتیة ) •

**( ترنگ )**

وەکه تنگه • دەنگي‌یـــــه •
وەکه چنگ رنگ ، شنگ ،
خنگ •
ع ـ ( صوتیة ) •

**( تـل )**

گرێ چۆلێ یـه • عرب ژی
ولــــۆ دبێژن • دبي ژعربي
هاتبي • دنـــاف گونـــدێ
کورماتجا ده گلک هاتیـــه
ژلەورا ئەم دنفیســــــن :ـ
تل کۆچەر ـ گرێ کۆچەرا ،
کۆچەرێ میرا •
ع ـ ( تـل ) •

**( ترال )**

مرۆفێ بێ‌کـــاره • دگۆتن •
ترالێ بەغدایێ ئەون کـــۆ
کارناکن ونان دخـــون • لێ

خەلك نان دخن دەڤێ وان • لبن دارێ خـــورما رودنن ودەما خورمە دوەشن كـــۆ نەكڤى دەڤێ وان بـخـــوە ناخن دەڤێ خوە لێ خويايـە كۆ دەروبو •

ع ـ ( الكسول او العجزة ) •

**( تقال )**

دولاب‌رێســـــي ناس‌دكن • ژقاشلێ كونـــدرا چێدكن ودخن ناڤ‌بەرا سنگ وتا •

ع ـ ( •• )

## ( ت ـ م )

**( تم )**

دبي ژ ( دەم ) يا ژ ( دائـم ) هاتبي • لێ كورمانج ( تـــم ودائم ) لپەى هەڤ دبێژن • خويايە كۆ نە ژ دائم هاتيە • ( هــــەرتم ) ژى تێ گۆتن • ژلەورا دبي ژ ( دەم ) هاتبي• هەرتم ـ هـــــەرچـــاخ ـ هەروەختە •

ع ـ ( دائـم ) •

**( تخم )**

كۆكـە • دبێژن :ـ بـــأرام تخمێ شێرايە • ئەڤ هـەسبا ها ژ تخمێ مەهينا مـە يـــا شێن بۆزە • ژ تخمێ مـــالا زۆرۆ ژنا مەوێنە كورێ من •

ع ـ ( الاصل ) •

**( تلم )**

ژتل بچوك ترە • تلمـك ژ تلم بچوك ترە : نــە گلك بلندە • دبێژن :ـ لســـەرێ تلم رونە تا ئەز ڤـەگـەرم • گوندێ مە دبشـــت ڤي تلمكي دەيە •

ع ـ ( اصغر من التل ) •

**( تلبسم )**

ناڤێ گونـــدكي ل دەشـــتا دياربەكەرە ايرۆ بويـە جهێ ( قايمقام ) • ( قرية ) •

**( تلشەحم )**

ناڤێ گونـــدەكي يە • لبـەر چەمێ دجلە ول دەشــــتا دياربەكەرە •

ع ـ ( قرية ) •

( تلسم )
ڤەشارديێ ســەر دەڤێ
گەنجینەیە • سرەکە دژوارە
کۆ کەس کاربي تێ دەرخي•
هن دبێژن :ـ مارەکی رەشە•
وهن دبێژن :ـ نفیساندنەکە
کــەس نزانی بـخوێني • لێ
خویادکی هەمو دەرەوە • لێ
دناڤ کورمانجادە گلگك هەیە
دبێژن :ـ تلسما پێکھاتنـــا
ڤێ چیرۆکێ بارامــە ، هــەرن
جەم وی ئەو کاری پێکبێني•
ع ـ ( تلسم ) او مفتاح الخفایا

( تمتم )
ناڤێ بەستاکە کورمانجییە
بەستە :

تمتم وتــم ، تمتم وتــم
تمتم وتم ، تم ئەمینا •••
ژ ( تم ) زێدە بویە • دائم ـ
دەم ••
ع ـ ( عنوان شعر شعبي ) •

## ( تۆ ـ ئه )

( تۆبە )
ژعربي هاتیە •
ع ـ ( التوبـــة ) •

( تۆربە )
تورەکە • ژ جاو چێ دکن •
مرۆڤ خوارنا خـــوە دخيێ
ول‌ناڤ ملێ خــوە دکي • ئێ
کۆ دچن سەفەرێ باش ناس
دکن • بچوکێ وی تۆربکە•
دبێژن :ـ تۆربـەکێ خوە دا
ناڤ ملێ خوە وبرێ کەت •
ع ـ ( کیس یحمل فیەذخیرتە)

( تۆدە )
ناڤێ پارتي یەکێ ل ایرانێ یە
حزبێ تـــــۆدە • دبي • ژ
( تەودە ـ تەڤدە ) هـــاتبي •
بداخوازا تەڤایي •
ع ـ ( الشعب ) •

( تۆرە )
ئەدەب ـ اخلاق • تۆرەڤـان
ئەدیب • لێ ل‌جەم مـــــن
( هۆزان ) بداخوازا ئـەدیب
وشاعرە • بەلام دکارن نـاڤێ
( تۆرەڤان ) ژ ئـــــەدیب رە
وناڤێ ( هۆزان ) ژ ( شاعر )
رە دروست بکن • ژ بەرکۆ

( هۆزان ) ژ ( هۆنان ـ تنظيم)
و ( هۆ ـ العلم ) هاتيه •
ع ـ (الادب والاخلاق) •

**( تۆقه )**

دەستێ هەڤ گوڤاشـــتنه •
دەستێ هەڤ هـــەژاندنه •
مەلايێ جزيري دبێژن :ـ
هێڤي و ( تۆقه ) دكم ئـــەز
ژ خوەدانا حەشەمێ
وێ نیگارو صەنم وپاشـــەو
محتەشـــــەمێ •
ع ـ ( المصافحة ) •

**( تۆله )**

دەرباس بويه • نەكوچـــكه
ونه تاژی يه تۆل تاژی يه •
ع ـ ( قد مر ) •
:ـ وەك تۆله لپـەی موچێ
لدۆرێ چەرخيم ئەز •

## ( تۆ ـ ئي )

**( تۆتي )**

تەيرەكه • ل ئەيوانا داتينن •
دەنگێ وي خوەشه •شاعرەك
دبێژی :ـ

:ـ تۆتي يێ ئەيوانم ئەز •

**( تۆسي )**

فردەوسێ تۆسي شـــاعرێ
نافدارێ ايـــرانه • ( تۆس )
گونده ـ يا باژارەكـــــه •
فردەوسي ژوي باژاری يه •
ع ـ ( مدينة ايرانية ) •

**( تۆري )**

خەلكێ تۆرێ نه • آشـــيتا
ژواره ولۆ دبێژن :ـ ڤايـــه
تۆري هاتن • هـــنگي ژوان
عاجزن ، ژ واويـــكا ره زي
دبێژن :ـ ( تۆريك ) •
ع ـ ( نسبة الى طور عابدين )

**( تۆلازي )**

چاڤ لدەري يـه • ژێدەرێ
تۆلازه • تۆلاز ئـــەو مرۆڤێ
كـــۆ تۆلازي دكي :ـ بارام
تۆلازه ـ چاڤلدەره • لدۆر
خەلكێ دگەري رەوشـــێ
تۆلازه ـ خـــەلـك لدۆر
دگەرن ـ بمێرێ خوه رازی
نابي • بێتر ژ خۆرت وكەچـا

ره تێ گۆتن •
ع - ( فاجر ) •

( تۆڤي )
ئه‌و ترۆزی وعه‌جـــــور و
په‌تیخێ کۆ ژبۆ تۆڤ هلتینن،
ژ له‌ما ناکن تاکۆ بـخـــــوه
هشک دبن - دپـه‌رخن بکێر
خۆارنێ نائین به‌س ژ بـــۆ
تۆڤــه •
ع - ( ما يترك للبزر ) •

( تۆني )
خه‌لکێ کـورد داغێ - چیایێ
کورمـــانج • دبێژن :- بڤي
تۆني ئه‌زناکم •
( تۆن ) لـچــــه‌م وان وه‌که
ره‌نــــگه - آوایـــــه •••
:- بارام چه‌تۆنه ؟ یاني چلونه؟
- چونـــه ؟ - چاوایـــــه !
بڤي ( تۆني ) به‌م جۆره - بڤي
آوایی • بڤي ره‌نـگي بـــــه‌م
آوا - به‌م چه‌شنه •
ع - ( الشکل ) •

## ( تۆ - ۆ )

( تۆ )
ژبـۆ غـــه‌یـد تێ گۆتن :
( ئۆتۆ ) ؟ ئه‌ز که‌تم به‌لا ته •
لێ پرێ جارا دگه‌ل ( ئـــۆ )
تێ گۆتن •
ع - ( يدل على العجز ) •

( تو )
بسۆرانی لشونا ( ته ) - (تو)
تێ : ( بۆ تۆ یه بۆ تۆ یه ) -
بۆ ته یه •　ع - ( انت ) •

( تۆتۆ )
ناڤه‌که - شونه‌که - ده‌رکه •
لێ که‌س نزانی لکویـــه •
ته‌نێ دبێژن :- بارام د (تۆتۆ)
ره ده‌رکه‌ت ، ئه‌زێ تـــــــه
دتۆتۆره ده‌رخم • ناڤه‌کی بێ
داخوازه (دوری) تێ ده هه‌یه•
ع - ( اسم بلا جسم ) •

( تۆیۆ )
گونده‌که ل ژێرێ (آمودێ)
یه •　ع - ( قرية ) •

( تۆخۆ )
ناڤێ مرۆڤه‌کی ئه‌رمه‌نی یه •
ئه‌گـه‌ر ژ ( توخ ) هـــاتبي
کوردی یه • ( تۆخ‌وآلا )••
د دیوانـــا جزیري ده گلک

هاتیـــه •
ع ـ ( اسم رجل ) •

## ( تۆ ـ پ )

( طوپ )
تۆپ • نافداره • ( مدفع ) ـ
( تۆپ )
دجاو ده پەرچاکه ل هـــەف هاتیـــه پێچـــان دبێژن :ـ طوپەک جـــاو بده مـــن • تۆپەک قماش بده من •
ع ـ ( قطعة من الخام الملفوفة)
( تۆپ )
دلیزێ ده شەپی یەکه مەزنــه ز لاســـتیک چێ دکن وپێ دلیزن •
ع ـ ( فوتبۆل ) •
( طۆپ )
خسارة ـ الافلاس • بـــارام طۆپ آڤێتیه • افلاس کریه ـ زیان کریه • بەلەنگاز بویه ـ دبن دەینا ده مایه •
ع ـ ( الافلاس ) •

## ( تۆ ـ ت )

( تۆت )
رونشتنا سەر نگێ خوه ، یـــا ل سەر کولیمەکێ خـــوه یه • دبێژن : بارام تۆت دایـــه ـ یانی ل ســـەر نگێ خوه ـ ل سەر بنێ خوه راوەســـتایه • رونشتی یه • دەما کوچک ل ســــــەر قـــونا خوه رودنی ـ رادوەســـــــتي دبێژن :ـ کوچکێ تۆت دایـــه • تۆتک بچوکێ ( تۆته ) دگرێدانـــا سەرێ ژنا ده تۆتک نافداره • هن دبێـــژن :ـ ( کۆفي ) • دارەکه دناڤ کوم وکۆفیـــا ژناده داتێنن داوەکو بـــاش بلند بيي • ( کۆفی کێلێ ئەوا کۆ کۆفیا وێ وەکه کێلەکێ یه • ع ـ ( القعود القنفسائیة )
( تۆقات )
باژارەکه • لترکیا دکـــەڤی • لێ دسترانێ کوردی ده تێ : :ـ کەمبەر زیڤێ تۆقـــاتێ نار هەی نار نار هەی نار•

## ( تۆ ـ س )

( تۆس )
یا ( طوس ) • بـــاژارەکي

ایرانه • ( فردەس ) شاعرێ ناڤداری ایران ژ ڤي بازاري يه
ع ـ ( مدينة ايرانية ) •

**( تۆرۆس )**
چيايێ طۆرۆس دناڤ بەرا وەلاتێ کوردستانێ وکليکيا ده يه • ئەرمن دبێژن :ـ چيايێ طۆرۆس دوەلاتێ مه ده يه • لێ زەنجيزيرێ چيايێ طۆرۆس دکەڤن کوردستانێ •

## ( تۆ ـ خ )

**( تۆخ )**
وا دياره • کۆ دسەرێ آل و بەيرەقا ده تونجەک هەيه دبەرقێني دبي ( تۆخ ) ئەو بي • لێ جزيری دبێژی :ـ آلا و تۆخ • وا دياره ل گۆرا گۆتاوي • ( تۆخ ) جياواز بي ـ سەربخوە بی •
ع ـ ( •• ) •

## ( تۆ ـ ز )

**( تۆز )**
ئەو تشتێ هوره • وەکه :ـ آخ ـ خوێ ـ آرد ••• تۆز دباري ـ آخ دباري •
تۆزەک خوێ بدە من ـ
تۆزەک آرد بدە من •هنەک خوێ ـ هنەک آرد بدە من •
ترک ژی تۆز دبێژن •
ع ـ ( الغبراء ) •

**( تۆلاز )**
مرۆڤێ چاڤ ل دەره •
ع ـ ( سرسري ) •

## ( تۆ ـ ر )

**( تۆر )**
پێ ماسيا دگرن • بارام تۆرا خوە بەردايه آڤێ ، ماسي کەتيه تۆرێ •
:ـ کەتمه تۆرا ته سێولەکێ ته بێ باڤێ ، ته نەزانێ •••
ياني بومه نێچير وەکه ماسي کەتمه تۆرا ته نەزانێ •
ع ـ ( الشبكة ) •

**( تۆر )**
هەريمەکه ـ دەمەکه •
لزۆرێ بازارێ ( نصيبين ) دکەڤي • ( تۆراباني ) دناف هەڤيرکا دەيه • شەرەفخان

دتاريخا خوەده نافێ کەلاتۆرێ دبێژي • دتاريخـا عربي ده ( طور عابدين ) نافێ وی یە• ( جبال خورعابدين ) چیایێ هـەڤیرکا یە • ( باجن ) و ( بەجنەخوێر ) دڤي چيـایی دەنە • جهێ ایلا ( بەجنەوی- بەشنەوی ) یە •

ع ـ ( طورعابدين ) •

**( تۆر )** آلاڤەکە • ژبۆ بێغـــەمی هاتیە :ـ ئەگەر بارام نـەچي تۆر ئەز ناچم • یاني نە غەمـا منە چە دبي بەرە ببي • هـن دبێژن :ـ تۆرا •

ع ـ ( أداة شرطي ) •

## ( تۆ ـ ش )

**( تۆش )** تالان و بەردی بەردانـــە ـ کەتەبەرە • دتۆشێ دە چـــە بکەڤێ بەر تە ژخوەرە دبي • گازن ژ کەسي نابي •

ع ـ ( النهيب ) •

## ( تۆ ـ ف )

**( تۆف )** دچاندني دە چە تشتێ کــۆ مرۆف دچێني تۆڤە • دپەزدە بەرانێ تۆف ، نێری‌یێ تۆف ژبۆ کۆ بەردن ناف پەز ژبـۆ گۆنا یە • تۆڤێ هەر تشـــتی بزرێ وی یە •

ع ـ ( البزر ) •

## ( تۆ ـ ق )

**( تۆق )** گەردەني یە • ژزیف وزێـر چێ دکرن وژنا دختن ڤرکا خوە ـ گەردەنا خوە • هـــن دبێژن :ـ گەردەني • دستران وبەستەیێ کوردی دە هاتیە :

کەچک هاتن زەري هـــاتن
تۆق بەني‌یێ خوە ڤەنانـــدن
ئەز ژ حسەبسا بەرادابوم •••

**( تۆق )** دبەر هالەتا دە ژ هاســن چێ دکن و مژانە و پرك و برك وشورك بـهەڤە گرێ ددن • پێرك ودارکا دخن بەر داکۆ

فرەھ نەبي •
ع ـ ( طوق ) •

**( تۆق )**
يا ( تۆقێ ) ناڤێ گونـــدەکی یـــــە •( تۆقێ وتاقێ ) دو گوندن لناڤ ایلا ئۆمەریا نە •
ع ـ ( قرية ) •

**( تۆراق )**
ژ دەو چێ دکن دەو دکەلێنن و دخن کیسەکي و بدارفـــە دکن • پشـــتي کۆ زوا دبي دبي تۆراق • بشـــیرانی رە خوەشە • لێ هنک هشـــک دکن و دهێلن زڤســــتانا • دناڤ آڤێ دە دپشـــێڤن ودکن دەو • مەهیرێ ژێ چێ دکن• دگەبۆلێ دە گەلەک خوەشە•
ع ـ ( اللبن المصفى ) •

( تۆ ـ ک )

**( تۆتک )**
بجوکێ تۆتە • ئەوێ کـــۆ تۆت ددي ـ ل سەر تۆتا خوە رودني :ـ بارام تۆت دایـــە ـ ل سەر تۆتا خوە رونشتی یـــە ـ لسەر قونا خوە رونشتي یە پرێ جارا ژ کوچـــکا رە تێ گۆتن • دبێژن :ـ بارام لڤـر بویە تۆتک ـ یانی رانابي •
ع ـ ( القعود کالقنفساء ) •

**( تۆتک )**
دسەرێ کومێ ژنا دە هەیە • دبێژن :ـ ل تۆتکا سەرێ وێ بنێرن • هن دبێژن :ـ تۆتیک کۆڤیا ســـەرێ ژنا یـــە • تەختەکی ـ پێژەکی دخـــن ناڤ پاشیا کوم و بقمـــاش دنخومێنن داویا کومێ ژنا پێ بلند دبي • لێ براستي نزانـم چاوا چێ دکن •
ع ـ ( طاقیـــة جانبها الخلفي مرتفع ) •

**( تۆتک )**
ناڤێ مرۆڤەکي یە •

**( تۆریک )**
واویکە • خەلکێ آشیتا ولـــۆ دبێژن • دبي ژ رکێ تۆریـــا رە ولۆ گۆتبن • ژبەرکـــۆ ( تۆریا ـ هەڤیرکا ) مالێ وان دخوار ودهاتن دزیا وان •

ع ـ ( الواوي ) .

**( تۆلك )**
گەیاکە . تێ خوارن . دقەلێنن وهێك وماست بەرددن سەر . ( تۆلكۆ ) گوندەكە . ژبەركۆ گلك تۆلك لێ شێن دبي نافێ وی بویە تۆلكۆ .
ع ـ ( الخبازة ) .

## ( تۆ ـ ل )

**( تۆرجەل )**
چیاكي بلندە نافدارە . ل شارێ دێركا چیایێ مازي دكەفي . دخۆرتانیا خوە دە ئەز چومە سەرێ چیایێ تۆرجەل . چیرۆكا من وچیایێ تۆرجەل دور ودرێژە .
ع ـ ( جبل معروف ) .

**( تۆفل )**
یا ( تیفل ) . قەتیتكن . تۆفلەك شەبەش بدە من . تەلیشەك شەبەش بدە من . هن دبێژن :ـ تیفلەك شەبەش بدە من .

ع ـ ( قطعة ـ شقفة ) .

**( تۆكل )**
گوندەكە . دكەفي رۆژهلاتێ شارێ ( قامشلۆ ) . ل ناف ( حەمكا ) یە . ژ ( آلیا ) تێ زمارتن .
ع ـ ( قریة ) .

**( تۆل )**
حەیفە :ـ بارام تۆلا خوە ستاند ـ حەیفا خوە هلاني .
تۆلستاندن ـ حەیفستاندن .
ع ـ ( الثأر ) .

**( تۆل )**
ژنا خەرابە ـ ژنا پیسە ـ ژنا تۆلازە . دستران وبەستا دە هاتیە :ـ

ئەرێ ! تۆلێ ! كەچا تۆلێ !
پێشمال شینێ گۆل بگۆلێ
خورتێ خەلكێ تە دین كرن
تە هار كرن بەردان چۆلێ ...

**( تۆل )**
كوچكێ بچوكە ـ بونجیيە . نەكوچكە ونە تاژییە . بێكۆك وبێرومەتە . یاني نەكوچكێ باشە ونە تاژییێ

باشه هن دبێژن:ـ تۆل‌تاژی•
ع ـ ( كلب حقير ) •

## ( تۆ ـ م )

**( تۆخم )**
توخم ـ تخم • تۆڤه ـ بزره•
خه‌لكێ ( دیاربه‌كر ـ آمه‌د )
دبێژن :ـ تۆخم ـ ئه‌م دبێژن:ـ
تخم • تۆخمێ مـــه نه‌باشه ـ
تۆڤێ مه نه‌باشه ـ نه‌چاكـه ـ
نه‌چێ‌یه • بزرێ مه نه‌باشه •
تخمێ چێله‌كا به‌له‌كـه • تۆڤێ
چێله‌كا به‌له‌كـــــه • بزرێ
چێله‌كا به‌له‌كه •
ع ـ ( البزر والزرية ) •

**( تۆرم )**
ده‌فه‌یێ پارۆنه‌یـــــه • كورد
دبێژن :ـ بارام لێڤ تۆرمه ـ
لێڤ ده‌ڤه‌یه • لێ نزانم تۆرم
ژكو هاتیه •
ع ـ ( صغير الابل ) •

## ( تۆ ـ ن )

**( تۆرن )**
زارووێ مال مـــه‌زنا • تۆرنێ
حه‌سه‌نا ، تۆرنێ مالا محمـــد
جزیـــــری ، تۆرنێ مـــالا
حسين آغا ••• لێ ایرۆ ئـه
كارن ژ زارووێ هه‌ر كمـــي
ره بێـــژن :ـ تۆرن • ژن ـ
مێرێ خوه ره دبێژن:ـ تۆرنێ
دفرده تێ خویاكرن كـــێ
تۆرن نه‌ته‌نێ ژبۆ مال مه‌زنه‌یه
چقا به‌رژێر هه‌ري هه‌ر تۆرنه
كوری كوری كوری مـروڤ
تۆرنـــه • هــــن دبێژن ـ
( نـه‌ڤي ) •
ع ـ ( الاحفاد ) •

**( تۆن )**
گۆشتێ گا و چێله‌كا دقوتیا ده
یان هه‌مو گۆشتێ دقوتیـــا ده
ژێره تێ گۆتن :ـ ( تۆن ) •
لێ نزانم ئه‌ڤ گۆتن ژ كـــو
هاتیـــه •
ع ـ ( اللحم المعلب ) •

**( تۆن )**
هه‌زار كیلۆغرامه • دژمـارێ
ده تێ گۆتن : هزار تـــۆن
گه‌نم ژ مه ره ایسال هاتیـه •
چار تۆن نۆكێ مه هه‌نه •
ع ـ ( طون ) •

## ( تۆ ـ آ )

**( توتیا )**
وەکە بافۆنــە ژتـەنـەکێ خورتتره •

## ( تو ـ و )

**( توو )**
تو ـ تـە • تي ـ تێ ـ تـۆ ـ ئەتۆ ••• هــەمو ب یەك داخوازێ نە :
توو دچي کو ؟ ـ تو دچي کو ؟ـ تـە خوار

تێ دخوي ـ تێ خواریــە •
تۆ ئەخوي ـ ئەتۆ ئەخـوی •••
گەر چە بداخوازەکێ نە ، لێ رەوشا وان نە یــەکــە جیاوازە •
ع ـ ( بمعنى انت ) •

**( توو )**
دارا تووێ ناڤــدارە • تووێ رەش ـ تووێ سۆر ـ تووێ سپي •••
ع ـ ( توت ) •

**( توو )**
قەیماغە • لێ قەیماغێ شیرە ئێ سەر ماست قەیماغە ، نـە توو یە •
ع ـ ( القشطه ) •

**( توتو )**
بەردانا مریشکێ یە ، وهارەنگە بانکرنا مریشکێ یە • ژن دەما گازی دکن مریشکێ دبێژن:ـ توتوتو •••• هەروەها دەمــا کش دکن مریشکێ دبێژن :ـ توتو !
ع ـ ( نداء للدجاج ) •

**( توت )**
کومرەڤینە • ناڤێ لێزەکێ یە• چەند زارۆك وەك چەمبەر رودنن ویەك کومــەکي ل پاش وان دگەرێني • گەرەکە ل پشت یەکي دەیني وبگەري تاکۆ بگهێ شونا خوە ، ئەگەر ئێ رونشتي ب کـــوم آگاه نەبو وکوم گەرین گها سـەر وێ لێ سواربي ول هاویــر چەمبەرێ بگەریني تــا بگهێ جهێ وي •••
ع ـ ( لعبة للاطفال ) •

( توس )
يا ( طـــۆس ) ـ بـــازاریٚ شاعریٚ ناڤداریٚ ايرانی يـــه فردەوسیٚ توسي • دەربـاس بويه •

( تونج )
كانگاهەكه • وەكه صفره •لیٚ ژ صفر بێتر خورته •تونجەلي ناڤیٚ چيـــاكي ناڤـــداره ل كوردستانا راژۆر دكـــەفي • دبي تونـــج دڤي چيـــايي دەهەبي •
ع ـ ( النحاس ) •

( توند )
بسۆراني بداخوازا هشـكه ـ خورته • ( توندی ) ژێدەریٚ وي يه •
ع ـ ( القوي او الجامد ) •

## ( تو ـ ر )

( تور )
نيڤ خورجكه • نانیٚ خـــوه تیٚده بدار ڤـــەدكن • گلك كاریٚ دي ژی ب( تور ) دبي بچوكیٚ وی توركه :ـ بـەره توري بەل بي تژه كەل وبەل بي :ـ چه د تور ده ؟ چـــه د هور ده ؟
ع ـ ( الجعبة ) •

( تور )
دەنگیٚ كۆڤكیٚ يه • دەمـــا ( آژۆ ـ شوفير ) ل كۆڤـــكیٚ دخي تورتور ••• ژیٚ تیٚ •
ع ـ ( صوت الزمارة ) •

( تور )
نـــاڤي چيـــاكي نـــاڤ داره ( بطورسيناء ) • ئەوچيايیٚ كۆ ( موسى ) گۆيـا بـخوەدیٚ ره آخڤي يه ـ پەيڤيیه • ئـەڤ چيا ددیـــــوانیٚ ( هۆزانیٚ ) كوردی ده گلك هاتيه •
ع ـ ( جبل الطور ) •

## ( تو ـ ش )

( توش )
لیٚراستهاتنه • دبێژن :ـ ئـەز توشي بەلايەك مـەزن بوم • يانی لەبەلاكه مەزن راستهاتم• :ـ ( توشيلافاویٚ جەهـــل بوم ) شعرا بیٚكەسه • يانی ل

پێلێ جەهلێ راستهاتم •
ع ـ ( التصادف ) •

( توش )
یاني ( توژی ) • تـو ـ ش •
ئەڤ ( ش ) شـــونا ( ژی )
دگـــري • منش ، توش ،
ئەوش •••
:ـ هـــن دبێژن :ـ ( تۆش )
دبي ئەڤ بێتر راست بي• هن
دبێژن :ـ ئەتوش •
ع ـ ( انت ایضا ) •

( توش )
لیزەکە زارۆکا یە • ل هێـلا
( عامــــوده ) پێ دلێزن •
خوەڤەشارتن تێدە هـەیـە •
یــەک لوان دگــــەري •
زارۆک باش ناسدکـــن •
لیزەکە دي ژی بڤي ناڤي هەیە
کۆ ل هەڤ سواردبن •
ع ـ ( لعبة للاولاد ) •

( توز )
رەنگە • توز ل بارام نەمایە •
رەنگ‌لێ نەمایە •
ع ـ ( اللون ) •

## ( تو ـ ژ )

( توژ )
دخوارنێ دە تامـــەکە دەڤێ
مرۆڤ دشـــەوتێني • پێڤاز ،
ایسۆت توژن •

( توژ )
دهن تشتادە بداخوازا لوسە :ـ
زمانێ توژ ـ لوسە • کابـــا
تۆژ ـ لوسە •
:ـ شور توژە ـ زو دبري •
گـــوزان توژە ـ زودبری •
:ـ بآواکي تەڤایي بداخوازا•
ع ـ ( الحاد ) •

## ( تو ـ ک )

( توک )
تفە • توکا بارام کەتە ســەر
چاڤێ رەوشێ ـ تفا وی کەتـە
سەر چاڤێ رەوشێ • ژ (تو )
هاتیە • بچوکێ (تو) یە •
ع ـ ( البصق ) •

( توک )
رەنـــگە ـ توزە • دبێژن :ـ
بارام ( توک ) لێ نەمایـــە •
توز لێ نەمایـــە ـ رەنگ لێ

نەمایە • دبي ژ ( تون )هاتبي•
ع ـ ( اللون ) •

( توتوك )
نافێ زرنێ یـــە • دبێژن :ـ
رەمـــۆ ل توتوكێ دخي ـ ل
زرنێ دخي • وهارەنگە بۆري
ژی توتوكە •
ع ـ ( البوق والزمارة ) •

( توتك )
مریشـــــــكە • ( توتكاندن )
بازدانا دیك لسەر مریشـكێ
یە • دبێژن :ـ دیك توتكاندە
مریشكێ • یاني بازدا ســـەر
مریشكێ :ـ
:ـ عەلۆل وتوتك وقـــاز
هـــەمی بونە بەلەنـــگاز
وان ژی وەكي مە كوردان
دەستێ خوە ژبەرخوەبەردان
:ـ دديوانا من یا پێشـــــي دە
هاتیە •
ع ـ ( الدجاج ) •

( تورك )
بچوكێ ( تورە ) • دەربـاس
بویە • دبێژن :ـ
بـــــەرە دلي بدل بي •
توركێ پارسی لمـل بي •
خوارنا مـــە گل گل بي •
بالیفێ بن سەرێمە كەفر بي
ستراںا دە گەلەك هاتیە •
ع ـ ( تصغیر الجعبة ) •

## ( تو ـ ن )

( توران )
دهەمبەر ایران دە هاتیـــــە •
دچیرۆك وسەرپێهاتيیێ مـە
دە گەلەك ئەڤ ناڤ هاتیە• لێ
هەر دەم ب نافێ دژمنـــــاهي
كوردا دچیرۆكێ خـــوەدە
آنینـە •
ع ـ ( أسم یطلق على الأتراك )

( توتن )
نافدارە وتەفـــایي یە • كورد
وترك وفارس وعرب تـەڤ
دبێژن :ـ توتن •
:ـ جـــارنا عرب دبێژن :ـ
( تەتون ) • ایرۆ بازرگاني ب
تـــــــوتنێ دبي • لێ گلك
فەخوارنا وێ نە باشە • تێدە
( نیكۆتین ) هـەیە • بـــەلام
مرۆڤاني پێرە چویە فەلاكەتێ

كي دكـــــاري دەف ژێ بەردي ؟

ع - ( التتون ) •

## ( تي - ئي )

( تي )

مرۆڤێ كـۆ بێ آڤ مايـــە • تيني - تهني • دبێژن :- بارام گەلەك تي بويـە • ياني زۆر تهني بويە - بێآڤ مايـــە • دبي ژ ( تين ) - هــــاتبي • بداخوازا هێرز - هێز - قوة - حرارەت - گـەرماهي‌بي • دبێژن :- تين تێ نەمـــايە • گەرمي تێ نەمايە - قوة تـــێ نەمايە •

ع - (العطش والحرارةوالقوة)

( تي‌تي )

ناڤێ چوكەكي يە • ژبەركـۆ بدەنگێ خوە دبێژي : تي تـي ••• ناڤێ وي بويە (تي‌تي) • : - وهارەنگـــە بويـــە ناڤێ مرۆڤەكي • ژبەركۆ وەكـــە تي‌تي يە • هوركە - بچوكە •

ع - (عصفور) •

( تي‌تي )

دەنگـێ بۆري وكۆڤكێ يە • ژبەركۆ گۆتەكە دەنگي يە •

ع - (صوت البوق) •

( تي )

بەرناڤەكـە • دبێژن : تـــي دخوي ••• تي چاكي ، تـــي باشي •

ع - (انت) ضمير •

( تي )

برايێ مێرێ ژنێ يـــە • ژن دبێژي :- تي يێ من • ياني براي مێرێ وێ يە •

ع - (اخ زوج المرأة) •

## ( تي - پ )

( تيپ )

بكورمانجي ناڤێ (حرفا) يە • تيپێ كورمانجي (٣٣) ســـيە وسێ تين • (٨) ژێ دەنگي‌نە : - آ - ئۆ - ئێ - ئوو - ئي - ئە - ئو - أ • ئەڤـــێ دي تيپێ سادەنە• لێ ل‌ناڤ‌كوردێ سۆڤيەتستانێ بێترن • ژبەركۆ دەنگێ زراڤ وقالن ژهــــەڤ دانە آليكي • چاوا كۆ خەلكێ سليماني‌يێ ( ر - ل) ستـــور

دخوێنـــن ودنفيسن • دناف
كوردا ده ايرۆ تيپێ كوردي
ب چار رەنگا دنفيسن :ـ ل
ايرانێ وكه فارسا ول عراقێ
هن تەڤگەر خستنه ناف تيپا
ول سۆفيەتســـتانێ ب تيـــپێ
روسي ول تركيا وســوريا ب
تيپێ لاتينـــي دنفيسن • (تيپ)
و (پيت) • سەر وبنێ هـــەڤ
بونه • هەردوژي بداخـــوازا
دەنگـــن • ژ (تەپ) و (پت)
هاتنه • هەردوژی • بداخوازا
دەنگن •
ع ـ (الحروف الكردية) •

## ( تي ـ ت )

( تيت )

زرافه ـ خوەشكه ـ جوانه •
(تيتك) پەرچێ شـــكەشتي ژ
نەينكێ نه ـ ژجامێ‌نه • هـــن
دبێژن :ـ ( تيتۆل ) بداخوازا
جوان وخوەشك • دبێژن :ـ
بارام تيت بويه • ياني بويـــه
وەكه تي‌تي يەكـــي ـ زراف
بويه •

ع ـ (الضعيف) •

( تيبت )

پەرچاك ژقادا چينـــێ يه •
مەزنێ وێ (دەلاي لاما) يـــه •
ئەڤ مرۆڤ مەزنێ ديـــــن
ودنيايه • لێ ايرۆ(دەلاي‌لاما)
ژ تيبت رەڤيا يه • نزانـــم كێ
شونا وي ستانديه •ئەڤ پەرچه
گەلەك ب پاش ده مايـــه •
دسينۆرێ هندێ ده يه •
ع ـ (معروف) •

## ( تي ـ ز )

( تيز )

يا تيـــزك • دەمـا ڤاتـــر
ـ هەسپ ـ كەر ••• ب لنگێ
خوه وژپاش‌ڤه پەهينا ددن هن
كورد دبێژن :ـ تيزكا ددن •
سەوالا شەموز تيزكا ددي •
ع ـ ( الرفس ) •

## ( تي ـ ر )

( تير )

دهەمبەر رۆن ـ رۆهـــن ده
هاتي‌يه • دبێژن :ـ خوارنا مه
تيره،نيسكامه تيرەياني نەرۆنه•

کەرەکە هـــن آف دسەردە هەبونا ، یا دڤێ هن آف بەردن سەر •

ع ـ ( •• ) •

( تیر )

تیـــر وکـــەڤان ژ چـــەکێ کەڤنارەنە • شـــاعرێ کورد آورێ یارا خوە وەکە تـــیر وبروێ یارێ وەکە کەڤـــان دبێنن • کەڤانێ ئەبرو ، تیرێ مژگان •

ع ـ (السهام والنشاب) •

( تیرد )

دەنگـــێ بـــۆري وبۆريـــا ئۆتومۆبیلێ یە • دبێـــژن : ـ تیرتیرا بۆریا وییە • وهارەنگە زرنە ژي دکي تیرتیر •

ع ـ (کلمة صوتیة) •

( تیر )

هۆخە • دڤادێ دە دەما پارڤـە دکن دبێژن :ـ ئەڤ تیرا منە ، ئەو تیرا تە یە • یاني ئـــەڤ هۆخا منە ئەو هۆخا تە یە •

ع ـ (شقفة من الارض) •

## ( تي ـ ش )

( تیش )

ژ تەریشێ کراسا رەتێ گۆتن:ـ تیشک ل کراسێ بارام کەتیە • یاني چریایە • کراسێ بـارام تیش‌تیشـي بویـــە • یانـــي پەرچەپەرچە بویە • دبـەزدە بداخوازا کـــەري هاتیـــە • تیشەک پەز کەریک پەزە •

ع ـ (قطعة) •

( تیرێژ )

رۆژێ تیرێژێ خوە بەردانـــە خوارێ • تیرێژێ تاڤانێ گهانە مە • تیرێژێ روناکێ (تیژکە)

( تیق )

## ( تي ـ ق )

ژن ژزارۆکێ خوە رە دبێژن: تیق تیق ••• ژبۆکـــۆ بکي تیق‌تیق و بـکەني • دبێژن :ـ بو تیق‌تیقا کـەنێ بارام • یاني گەلەك دکەني •

ع ـ ( القهقهة ) •

## ( تي ـ ك )

( تیرك )

دارکێ چنارا یـــە • لێ ئێ

ڤالونێ ( شقڤالونه ) • يـــا ( شقڤهلون )ه • سەرێ تیرکا آغێ کارەبانــه • ســـەرێ شقڤهلونا آغێ کارەبانه •
ع ـ ( •• ) •

( تیك )
مرۆڤێ ژیهـاتي وپێبوي یه • دبێژن :ـ بارام تیکه ، یـــا شەکه • ژیهاتیيه • پێبويیه لخوه ناحەیري ـ کـــاری کەلەکا خوه ژ آڤێ دەرخي •
ع ـ ( النشیط ) •

## ( تي ـ ل )

( تیفل )
قەتیتك • تیفلەك شـــەبەش بـــده مـن • قەتیـــکەك شەبەش بده من •
ع ـ ( قطعة ) •

( تیل )
توژه • کابا من تیله ـ کابا من توژه ـ شـوته ـ لوســـه • شایکه ـ ژێ هاتیـــه برین • کابا رەشۆ تیـــله ـ توژه ـ تیژه •
ع ـ ( أملس ) •

( تڤیل )
یا ( تڤیلك ) ژ کـەوا مێ ، ژ کەڤۆکێ بچوکتره • لسەر دارا داتینی • رەنـــگێ وێ وەکه کەڤۆکێیه • زارۆك ب شاڤولا نیچـــیرا وا دکن • هن دبێژن :ـ ( تیتڤیلك ) • دبي ( تڤیل ) مەزنێ وێ بي • لێ تڤیلك ـ تیتڤیلك بچوکێ تڤیل بن •
ع ـ ( طیر یشبه الحمامة ) •

## ( تێ ـ ئێ )

( تێ )
بەرناڤـه • دبێژن :ـ تێ مالێ من دخوي خوەدێ کەریمه • تێ بێ ئەم هـەرن بازێر ؟ تێ چه بکی ؟
ع ـ ( أنت ) •

( تێ )
ناڤێ تیپا ( ت ) یه • دبێژن :ـ الیف ، بێ ، تێ ، ســـێ •• .
ع ـ ( اســـم لحرف ت )•
وهارەنگه ( تێ ) کرنا ناکا یه• دبێژن :ـ کا بـارام نەهات ؟

دبەرسڤا ڤێ پرسـێ دە تێ گۆتن :ـ بارام تێ • سـۆرا دبێژن :ـ ( دێ ) • لجـەم کورمانجا کرنا ناکـا وهێتێ هەیە • لێ ل باسۆرا هـەر تەنێ کرنا دومل هەیـە • :ـ دکورمانجی دە :ـ خوار ـ دخوی ـ دێ بخوي • بەلام دسۆرانی دە :ـ خـوارد ـ ئەخوی • ( ئەخوي ) یـا ( دەخوي ) دومله :ـ ناکـا وهێتێ یە •

## ( تێ ـ ئۆ )

**( تێلۆ )**

ناڤێ مرۆڤـەکی یـە • ( عبدێ تێلۆ ) ناڤێ هەڤالەکي منە کۆ بەري هەر کەسي من ئەو ل عامودێ بکـوردی ـ کوردپـەروەری ناس کر • سەرپێهاتي یا مـن وعبـدێ تێلۆ گەلەك دور ودرێژ •

ع ـ ( اسم رجل معروف ) •

## ( تێ ـ ئي )

**( تێلي )**

ناڤێ کورەکي بدرخان پاشـا یە • ( باڤێ تێلي بەگێ ) ناڤ و دەنگێ وی بو • پاشێ بویە ناڤێ مێرا •

ع ـ ( اسم امیر کوردی ) •

**( تێني )**

یا ( تهني ) مرۆڤێ کۆ گەنەك تي دبي • بارام تێني یـە زۆر تي بو یە • ( تێن ) دەربـاس بو یە • خورتي وگـەرماهی یە • تي بویە ـ بێ‌آف مایە •

ع ـ ( عطشان ) •

## ( تێ ـ ئە )

**( تێدە )**

دفردە ( ئێ ) بـداخـوازا بەرناڤە :ـ بارام دچالێ دە یە• بارام تێدە یە • دڤێ پەیڤـا پاشي دە ( ئێ ) شونا (چالێ) ستاندي یە • ( ت ) بداخوازا (د) ژبۆ ( تێدەبون ) هاتیە • ( دە ) ـ ژبۆ بجیـکرنە • پاش‌مێرە ژبۆ ( د ـ ت ) کۆ ل پێش هاتیە •

ع ـ ( فیە ـ فیها ) •

**( تێرە )**

وەکە ( تێدە ) هاتیـە • لێ

دڤێ ده دەرباس‌بون هیـــه • بەلام د یا پێشي ده ماین هیه:ـ بارام دچي‌يێ دەيه ياني تێ ده مايه ـ جي گرتي يه • بـارام دچي‌يێ ره چويه ـ دەربـاس بويه • تێده نەمايـــــه ـ جي نەگرتيه •

ع ـ ( الظرفية ) •

( تێڤه )

وەكه هەڤالێ خوەيـــــه • لێ رەوشا وێ جياوازه ـ جدايه• دبێژن :ـ تێڤه خويايه • تێڤه وەره • دهــــــەموا ده ( ت ) بداخــــــوازا ( د ) ژ بــــۆ تێدەبونه •

ع ـ ( للظرفية ) •

## ( تێ ـ ت )

( تێشت )

تاشتێ يه • سۆراني يه •

ع ـ ( غداء ) •

( تێر )

ژهري ومور چێ دكن • ژبۆ بارا يه • بارێ كـەروڤـاترو گايه • كورمانج دبێژن :ـ تێر كر دو تور •

( تێر )

بارام تێر نان ناخوي • نانێ مه تێرا مه ناكي • ئـــــەز تێرم نكارم ب‌خوم • هەبونا وەلاتێ مه تێرا مـەدكي بـــارام تێرا فەرهاد لێ‌خست •

ع ـ ( الـكفاية ) •

## ( تێ ـ ك )

( تێك )

تەواو ـ هـــەمـــــو ـ گش ـ گشتك ـ تەڤ ـ ب‌جارەك• دبێژن :ـ تێك وەرن • ياني گش وەرن ـ تـــەڤ وەرن ـ تەواو وەرن ـ هەمو وەرن •

ع ـ ( الـكل ) •

( تێلك )

بچوكێ تێله •

ع ـ ( تصغير للتيل ) •

## ( تێ ـ ل )

( تێل )

ناڤداره • دگەلەك تشـــتا ده تێ :ـ تێلێ تەنبـــورێ ، تێلێ هاســـني ، تێلێ پەمبو ، تێلێ بسكا ••• ياني يەك‌تا • تێلەك ـ آڤداك • تێـــــلا

تەنبورێ ـ آڤدا تەنبورێ •
ع ـ ( السلك ) •

**( تێکەل )**
تێکەلاوە • تەڤلیھەڤە :ـ جەھ وگەنم تێکەل بونە ، بەرخ ومي تێکەل بونە ـ تێکەلاو بونە • تەڤلي ھەڤ بونە • لناڤھەڤ کەتنە •
ع ـ ( الاختلاط ) •

**( تێکل )**
بارام وفەرھاد بونە تێکلێ ھەڤ • ( تێکلي ) ژێدەرێ وێ یە تێکلي‌یا من و تە بھەڤ نینە • ئەز خوە تێکلي وە ناکم • ئەز تێکل نابم •
ع ـ ( العلاقة ) •

## ( تێ ـ و )

**( تێکەلاو )**
سۆراني یە • وەکە (تێکەل) ھاتیە • جۆ وگەنم تێکەلاو بونە • یاني جە وگەنم تێکەل بونە • بەرخ ومەر تێکەلاو بونە ـ بەرخ ومي تێکەل بونە • چەمێ دیالە وچەمێ دجله لەژێرێ بەغدا تێکەلاو ئەبن •
ع ـ ( الاختلاط ) •

## ( سا ـ آ )

**( سا )**
بداخوازا رەنگە • وەسایە • یاني وەرەنگە • دڤردە ( سا ) بداخوازا رەنگ ھاتي‌یە •وەسا بکە ، وەسا مەکە • •
ع ـ (بمعنى اللون) •

**( سا )**
دشیوەیێ سۆراني‌دە یا (دەسا) بداخوازا (جا) و (چکا) ھاتي یە •

**( سادا )**
گوندەکە • ل رۆژھلاتێ بازارێ ( عامودە ) دکەڤي • وھارەنگە گوندەکە • لناڤ ئۆمەري‌یا دکەڤي • لڤي گوندي شەرەکي مەزن چێبویە •

ع ـ (اسم قرية) •

( سارا )

ناڤێ ژنه‌كێ‌یه • وهاره‌نگه
ناڤێ سترانه‌كه كورمانجی‌یه :
ع ـ (غناء كوردی) •

( سالها )

ائیله‌كه كورده •ل‌ناڤ هه‌ڤیركا
دكه‌ڤي راژۆرێ رۆژ هه‌لاتێ
بازارێ ( نصیبینێ ) یه •
(سالها ودومانا) دو باڤكن
ژهه‌ڤیركانه •
ع ـ (عشيرة كوردية) •

( سافیا )

گونده‌كه • ل‌ناڤ سلیڤایه •
دكه‌ڤی ده‌شتا ( دیاربه‌كر ـ
آمه‌د) • سترانا :ـ (باڤێ
به‌هجه‌ت) و (خێریاحه‌جی)
ل‌ڤي گوندي چێ‌بویه •
ع ـ (قرية مشهورة) •

( سایا )

بداخوازا خێر هاتی‌یه •
دبێژن :ـ ب‌سایا سه‌رێ ته
ئه‌م پاریك نان دخون • یاني
ب‌خێرا سه‌رێ ته ئه‌م پاریك
نان دخون •
ع ـ (خير وفضل) •

( سایا )

ساده ـ صافی‌یه • دبێژن :ـ
خه‌فتانێ ره‌وشێ سایه یه •
ساده یه ـ بێ گول وخێز
وبێ ده‌قه • ژیه‌ك ره‌نگی
هاتیه چێ‌كرن •
ع ـ (الصافي) •

## ( سا ـ ئۆ )

( سارۆ )

ناڤێ ژنه‌كێ‌یه • به‌ستاك
لسه‌ر هاتی‌یه چێ‌كرن •
:ـ دێ مه‌لي سارۆ مه‌لي
چیا ل چیا نه‌ري
ئۆرده‌ك ژگۆلا ڤری
حاكمكی عادل رابو
سه‌رێ ظالما بری •••

( سادۆ )

ناڤێ مرۆڤه‌كی‌یه • سادێ
حه‌مێ گاسۆ ل‌چیایێ‌رۆژهلاتێ
دێركا جیایێ مازي ب‌مێراني
ده‌نگ دابو •
ع ـ (اسم رجل مشهور) •

( سافۆ )
ناڤێ وێ سێنیا کۆ خوارنێ‌یێ سافي دکن • دبي ژعربـــي هاتبي • وهارەنگه ناڤـــێ ژنەکێ‌یە •

ع ـ (مصفاة) •

( ساکۆ )
یا (ساقۆ) •جاکێتە • دبێژن :ـ بارام چویە باژێر ژخـــوەرە ساکوك کریە • ســـاکوێ فەرهاد نەخوەشـــکە • زۆرۆ شەروالێ خوە بێ ساکـــۆ لخوە کریە •

ع ـ (جاکیت) •

# ( سا ـ ئي )

( ساري )
دهەمبەر گـەرمي دە هاتیە • دبێژن :ـ بارام هاسن ب ساري دجویي • یاني گلك زۆرکەر وخوین خوارە ••نان بساري نایێ خوارن •

ع ـ (البرودة) •

( ساغي )
سلامەتي‌یە • دبێـــژن :ـ دە باڤێ وە مر بەرە ساغیا وەبي• یەك ژیەکـــێرە دبێژي :ـ گەلۆ حالێ وە چاوایە ؟ ئـەو دبێژي :ـ دە بەرە ســـەري ساغي بي ، مالێ دنیایێ تـــه تشتەکە •

ع ـ (البقاء) •

( سايي )
ناڤێ خەفتانەکي‌یە • سادەیـە ـ بێ دەقە • مێر لخوە دکن• هن دبێـــژن :ـ ســـاهي • وهارەنگه سايي دهەمبـــەر هەوراف دە هاتیە • دبێژن :ـ ایشەڤ ساهي‌یە یا سايي‌یە • یاني ئەزمـــان ـ آســـمان سادەیە ـ سافي یەـ بێ‌هەورە•

# ( سا ـ ئه )

( ساتۆرە )
داسەکە دەڤ پان وگرانـە • گۆشت پێ هور دکن •

( سادە )
یاني سایە • چاوا دەربـــس بویە سایـه بداخـــوازا سادە هاتیە • دناڤ‌بەرا وا دە فەرق

نيه :ـ سايه ـ سايي ـ ساده
بداخوازه‌كي نه • خوندن
دچاخێن رابۆری‌ده سايه
هه‌بو وبزێروزه‌به‌ر هه‌بو •
ئێ‌كۆ بسايه درسا خوه‌نده‌وارێ
خوه بكۆتا ئه‌و سه‌يدا بو •
(سايه‌دا) بو • لێ ئێ كۆ
بزێروزه‌به‌ر ده‌رسا شاگردێ
خوه بگۆتا نافێ وی (مه‌لا)
بو • ع ـ (الصافی) •

## ( سا ـ پ )

**( ساپ )**

ئه‌و قه‌سه‌لا كۆ دگه‌ل جه
و گه‌نم تێ سه‌ر بێنده‌رێ •
دبێژن :ـ م ساپێ خوه
په‌لخاندی‌يه ـ كێره كريه ـ
شكاندی‌يه • (ساپان) ئێ‌ساپ
دچني •
ع ـ (سيقان الحبوب) •

**( سات )**

يا (سالت) ئێ كۆ بسه‌رێ
خوه هاتيه • دبێژن :ـ بارام
سالت ياسات هاتيه • ياني
بسه‌رێ خوه هاتيه •

ع ـ (بمفرده او بمعنى المجرد)

**( ساروج )**

هاسنه‌كي پان وبدوخه تێ دده
آگر ساردكن ـ دگوهێزن •
ع ـ ( •• ) •

**( ساخ )**

يا ( ساغ ) ده‌رباس بويه •
بداخوازا ژيندار‌ه • بەره
تو ساخ‌بي ـ به‌ره تو
ساغ‌بي • به‌ره تو ژيندار‌بي•
ع ـ ( السلامة ) •

**( سالۆخ )**

يا ( سالۆغ ) ده‌نگ وباس
واخباره • وهاره‌نگه نيشان
وپه‌سن و دروڤه :ـ
هه‌چي سالۆخه‌كێ ژده‌لالێ
مالێ ژ م ره بينێ •
ئه‌زی بدمێ حه‌فت آشێ
مالا بافێ خوه كه‌چكێ
لبه‌ر چه‌مێ نصێبينێ •
درێزمان وده‌ستورا زمانێ
كوردی‌ده • بداخوازا (خبر)
هاتيه •

**( سابلاغ )**

يا سابلاخ • بازارەكی كوردە ل رازۆرێ كوردستانا ایرانێیە • پاێتەختا جەمهوریا كۆ بسەركیا ( قازی محمد ) دسالا ١٩٤٧ تادە هاتە لدارخستن •

ع ـ ( مدینة كوردیة بشمال كوردستان ایران ) •

**( ساروخ )**

ناڤدارە • یەكتیاسوڤیاتی وئەمریكا دمەیدانا ساروخا دە گلك بپێشڤە چونە • بآلیكاریا ساروخا گهانە زۆرێ ئەزمانا •

ع ـ ( معروف ) •

**( سار )**

یا ( سارد ) دهەمبەر (گەرم) دە هاتیە • دبێژن :ـ نانێ وە سارە ـ ساردە • یانی نەگەرمە • ایشەڤ سارە • ئەم شەوە ساردە • یانی سەرما زۆرە ـ پرە • ساری ـ سەرما ـ سەرم ـ هەمو

بیەكێ داخوازێنە •

ع ـ ( البرد او البارد ) •

**( سافار )**

ساوارە • گەنمێ كەلاندی وكوتاییی وهێردییە :ـ ایرۆ سافارێ مە دهێرن • زارۆك دەما كۆ باران نایێ بوكێ چێدكن ولناڤ مالا دگەرێنن ودبێژن :ـ

:ـ گۆلكا مە گەیا دڤێ
:ـ بوكا مە سافار دڤێ
:ـ مەژ خودێباران دڤێ•••

**( سالار )**

ناڤێ پادشاهەكی كوردە • سالار كورێ مامەلان • پادشاهێ آزەربایجان وكوردستانا رازۆرێ ایرانێ بو • تاریخ دور ودرێژ داباشا ڤي جامێری دكن • :ـ دەیسەم كورێ ابراهیم پادشاهێ كوردستانا رۆژآڤایێ آزەربایجان بدەستێ ڤي سالارێ هاتیە گرتن •

ع ـ ( ملك كـــوردي في آزەربايجان ) •

**( ساز )**
آلاف وآلاتێ موســـيقانه • ( سازبەند ) ئێ كۆ ل سازێ دخي • سازبەند سـۆلبەند ، نالبەند •• بـآليكاريـــا ( بەند ) هنك ژ ( كرۆكى ) پارچيــــم پيك تێ • لێ ( كرۆك ) ددەستورا زمانێ كوردي‌دە تيكەلاو هاتيــه • وهارەنگه ( پێكراو ) ژي ولۆ بويه• ژوانرە آورەك دڤێ• تا جارەكه دي بێ چاپكرن •

**( ساق )**
ژ ( موو ) چێ دكن• كاركەر دخن ساقا خوە ـ چيما خوە•

**( ساك )**
گۆلگا گاميشايه • ( ســاكۆ ) نافێ مرۆڤەكي‌يه • ســاكۆ چاكيته • ( ساقوية ) •

## ( سا ـ ل )

**( سال )**
دوازده مەهن ـ دوازده مانگن • (٣) بۆهار • و (٣) هاڤين • و (٣) پائيز • و (٣) زڤستان• ع ـ ( السنة ) •

**( ساتل )**
ژ هاســـن تێ چێكرن • بێ آڤێ دكشـــێنن • لێ گلك نفشێ وێ هەنه :ـ ساتـــلا آڤێ ، ســــــاتلا بيرێ • ساتلابچوك ، ساتلامەزن • • ڤێ ساتلێ تژە آف بـكه • ێ هن دبێژن :ـ ( سيتل ) وهـ دبێژن ( سەتل ) •

**( ساكول )**
مرۆڤێ كۆ مرۆڤ لێ بـچڤێ بچوك تەماشا بكى • دبێژن: هێ تو ســــاكولي لاوۆ : ، ساكولێ حەرام •
ع ـ ( الرجل المنحط ) •

**( سالول )**
جهێ كـــۆ گرتي‌يێ دزو تەنێ تێدە دخن زنـــدانى • دناڤ زندانێ ده جيكي تەنگ وتەنێ هەيـــه كۆ گرتي‌يێ خـــورت وب باوەرى تێده

دگرن • لێ نزانم ژکـــو هاتیه ؟ عرب ولۆ دبێژن •
ع ـ ( الحبس المنفرد ) •

## ( سا ـ م )

**( سام )**

دبێژن :ـ یەك ژچـــار کوریـــن ( نۆح ـ نوح ) پەیغامبەرە :ـ سام ، حـام ، ایرەج ، تورەج • لێ ئـەز باوەر ناکم • ژبەرکۆ مرۆڤ هەمو یەك پەرچەیە • نـە سامي هەیە ونە حامي ونـە توري ونە ایراني • ژهـەڤ جدابونا مرۆڤا تەنێ ب زمـان وجیگەهە • جارنا ملەتـەك نەوەکهەڤیا زمان یا ئۆل یـا ژهەڤ دوربون ، دبن چـەند ملەت • وجارنا چەند مـلەتێ دژمنێ هەڤ بڤی آوایي دبـن یەك ملەت • بـــەلام آورا نژادی ، ورەنگ دەرەون •
ع ـ ( سام ابن نوح ) •

**( سام )**

ناڤێ گەرناســـەکي کوردە کالك وباپیرێ ( روستەم ) ئێ ناڤداره • دبێژن :ـ روستەم کورێ زال کورێ سام کورێ نەریمان • ( شـــەرەفخان ) دبێژی :ـ ئـەڤ روســـتەم کوردە • دشەهنامێ دە چەند پەند وبەستە هاتنە :

یەکی جـام وبـــادە
روستەم ســـوپەرد
بەوي گوڤتي کـــەی نامێ
بـــەرداریێ گـــورد
بگۆیەد کی گـــوردان
تـــەرا خاســـتەند
سەري تەختي ایـــران
بیـــا راســـتەند •••

سید حسین مکریانی دبێژی:ـ گۆتـــا ( گورد ) دڤـــردە ( کوردە ) وڤێ چیرۆکێ دور ودرێژ بدارڤە دکی • وهـــا رەنگە هن تاریخ بێژیـــن رۆژآڤا ورۆژهەلات دبێژن :ـ ( کورد ) ژ (گورد) بداخوازا گەرناس هاتیە •

ع ـ ( سام جد روستم المشهور ) •

## ( سا ـ ن )

**( ساپان )**

ئێ کۆ ساپ ددروي ـ دچني ـ پاله‌یه • لێ ل چهم کورمانجا ( ساپان ) داسه‌که مه‌زنه پێ پاله‌یا گه‌یا وده‌خلێ دکن • دشکێنن ودبرن بساپانێ وپاشێ بسێ گولیکا کوم دکن ، ددن هه‌ف • تـه‌نی ل‌وه‌لاتێ مه پاله‌یا داسێ هه‌یه •

ع ـ ( آلة للحصاد ) •

**( ساتان )**

یا ساتێن • قماشه‌که • نه‌گه‌له‌ك گران‌بهایه • ژیه‌مبو چێ‌دکن • گه‌له‌ك نفشێ وي هه‌نه :ـ زه‌ر ، که‌سك •••

ع ـ ( قماش معروف ) •

**( ساسان )**

کالك وباپیرێ مالباتا ساسانی یه • ئه‌رده‌شێرێ کورێ ( بابه‌ك ) ئێ کۆ بویه پادشاهێ کوردستان وایران که‌ڤاره • دبن ده‌ستێ ، یـ دبن ناڤێ فارس ده ئێ کۆ ناڤ‌داربون (٣) مله‌ت بون • کورد ، ده‌یله‌م ، جیل ـ یا گیل • ژڤا هه‌رسێ باڤکا ره پادشاهي دروست بو ئه‌وێ دي وه‌که ئه‌رمه‌ن ، عرب ، آشور ، مه‌قدونیا ، گریك بن ده‌ست‌بون • ئه‌رده‌شێرێ کورێ بابه‌ك بخوه کورد بو • ئه‌رده‌وان کۆ ئێ پاشي ژپادشاهێ أشکانیا بو نفیساره‌ك بۆ ئه‌رده‌شێر شاندیه ، دنڤسارا خوه‌ده دبێژی :ـ ( ایها الکردي ) تو مرنا خوه بده‌ستێ خوه نێزیك دکی • کێ ده‌ستور ژته‌ره دایه کۆ تاجا ایران بدی سه‌رێ خوه • ژڤێ نفیسارێ تێ خویاکرن کۆ براستي کورده

ائ پشتي اسلامێ دەیەلـــەم وکورد ژ جیل جیـاواز بـون ونافێ ( فارس ) بو پارا جیل•
ع ـ ( جد الساسانیین ) •

**( ساسون )**

چیاکي نـــاڤدارە لـژۆرێ خەرزایە • دەرەبەگیا ساسون ناڤدارە • خەلکێ چیـــایێ ساسون بـمێراني دەنگ دانە• پشتي دەستهلانینا (شیخ سعید) دسالا ١٩٢٥ دە خـــەلـکێ ساسونێ چەند ســـالێ دور ودرێژ لـبەر خوە ددان وخوە نە سپارتن دژمنێ خوە • مالا ( علیێ ئونس ) دڤـــــا سەرێهاتیـا دە خودي نـاڤ ورومەت بون• شەرەڤخان دبێژی : ساسوني ژ ساساني هاتیـە • دبێژی :ـ دەرەبــــــەگێ ( بەدلیس ) و ( ساســـون ) ژمالا ( ئەنوشـــــي رەوان ) کەسرایێ ناڤدار هاتە •
ع ـ ( جبل مشـــــهور في

کوردستان المحتلة من قبل تركیا ) •

**( سامان )**

دبي ( صبر ) بي • ل لــــەپي هەڤ تێن : صبر وسامانم نەما • بێ صەبر وبێ صـــامانم • ژلەورا دبێژم صەبروسامان یەکن • لێ دوەلاتێ مــــەدە ژبل خوشـــــخوان وتۆرە و هۆزاني پێڤــە پەیـــدا نا بي ژلەورا باوەر دکم ژفارســــي هاتبي •
ع ـ ( الصبر ) •

**( سالیان )**

خەراجا سالانە یە • گزیـــر ژگوندیا رە دبێژي :ـ هــەر یەک ســـالیانا وە چیـــــە ؟ بدەستێ خوە وەرێنن ئۆدێ • حکومەت سالیانێ ژمـــــــە دخوازی • وا دیارە کـــۆ بەرێ هـــەر تــــەنێ کوردا سالیانەک ددانە حکومەتێ ، یان دەرەبەگیا خوە •
ع ـ ( الضریبة السنویة ) •

# ( سا ـ و )

**( ساو )**

يا ساوير • رەشكێ شـــەڤێ يە • ژترسـا لبەر چـــاڤێ قەلسەمێرا ساوير چێ دبن • دبێژن :ـ ئەرۆ ! وەكـــــە ساويرەكێ لبەر چـــاڤێ م كەت • ياني هــــەروەكـو رەشەك هاتە بەر چاڤێ من • لێ نە بـجي يە • دهەرێ ـ نادە يە • چاوا چاڤێم لێكەت م ژێ ساو گرت • ياني ئـەز ژێ ترسيام •

ع ـ ( الخوف والاشباح ) •

# ( سه ـ آ )

**( سەبا )**

بايێ سپيدێ يە • دهــۆزاني وتورەڤاني دە گلك هاتيـــە : ئەي سەبا ! ئەي بادێ سەبا ـ بايێ سەبا •

ع ـ ( نسيم الصبح ) •

**( سەبا )**

بداخوازا سەبۆني ـ ژبۆني • هاتيە • سەبا خاترێ گەورێ ئەز هاتم ڤرا • هن دبێژن :ـ سەبوني چاڤێ رەشـە بەلەك گلك شندۆلێ مێرا ژنێ خوە بەردانە •••

ع ـ ( لاجل ـ بسبب ) •

**( سەزا )**

بداخوازا آنگۆرە بارام زايـە ياني • بارام هێژايە •

ع ـ ( اللياقة ) •

**( سەرما )**

دداباشا ( سار ) دە دەربـاس بويە • دهەمبەر ( گ ەرما )دە هاتيە • سەرما زڤســـتانێ ، گەرما هاڤينێ • ڤێ سەرمايێ ئەزێ هەرم كۆ ؟ ســەرما ـ سەرمايێ سارديێ يە •

ع ـ ( البرد او البرودة ) •

**( سەرەتا )**

( سەرنامە ) يە • سۆرانييە• بداخوازا ( مقدمة ) هاتيـــــە دانين • لێ باوەر دكـــــم نەراستە • ژبەر كۆ (سەرەتا)

بداخوازا ( اول الكتاب ) تێ ،
نه بداخوازا ( مقدمة ) تێ •
ب آورا مـن دبي بێژن :ـ
( بەرنامە ) وەكە ( بەرنامچ )
ژ ( بەرنامچە ) هـاتيـە •
بچوكێ ( بەرنامە ) يـە •
ئەڤ ولۆيە كۆ ئەم ( بەرنامە )
ژ نقشتێ نەژمێرن • لێ كـۆ
( بەرنامە ) ژنقشـتێبي •
دروستە ( سـەرەتا ) ژي بێ
گۆتن •
ع ـ ( المقدمة ) •

**( سەرا )**

ئەيوانەكە مەزنە ـ آڤـاني
يەكە مەزن وفرەھ وبلندە •
جهێ رونشتنا حكومەتێ يە •
ل هەر باژارەك سـەراك
هەيە • ددەمێن كەڤـارەدە
( سەرا ) جهێ سەرەكـا
بو ـ جهێ مـەزنـا بو •
سەرەك دبن ( پادشاه ) رەنە
• لشونا دەرەبەگ ـ امـير
هاتيە • هێژى كورد ژ مەزنێ
ائيلێ رە دبێژن :ـ (سەرەك)
بچوكێ ( سەرە ) (گەرەك)
ژ ( سەرەك ) بچوك ترە •
سەرەك ـ سەرێ ائيلێ يە •
گەرەك گرەگرێ ائيلێ نە •
( كەسرا ) ژ ( كـەي ) و
( سەرا ) پارچيم بويـە •
كەي بداخوازا مەزنە • ياني
مەزنێ مەزنا ـ ياسـەرێ
سەران • ( سـەرا ) جهێ
سەرا ـ جهێ سەرەكا يە •
ع ـ ( دار الحكومة ) •

**( سەما )**

گۆڤەند و ديلانە :ـ بسـك
وكەزي هاتن سەما • ئـەم
بسەمايێ برن • دديوانـا
جزيري دە گلك هاتيە • لێ
دزارێ كورمـانجي دە
دآخاڤتن ودان وستاندنێ دە
( سەما ) من نەبهيستيە •
گۆڤەند وديلان وچـۆبي
وبێلۆتە ••• هەنە • ژ لەورا
دبي ژ ( سەماح ) هاتبي يـا
ژ فارسي هاتبي •
ع ـ ( رقص السماح ) •

( سه‌هپا )

سێپا یه ـ سێپي یه • ئـه‌و
سێ دارن کۆ مرۆڤا یـــان
تشته‌کي ب‌وانڤه بدارڤه دکن
• سێ (۳) ره‌قه‌م ســـێ‌یه •
( پـا ) ـ پي ـ نگ ـ لنگه •
یا ژ ( سێ‌په‌رچه ) هاتیـــه •
ئه‌گه‌ر ( پـا ) بداخـــوازا
( پار ) ـ په‌رچـه ـ هاتبي •
پارچه بچـــوکێ پـــاره •
:ـ جاما دلا سه‌د پاره کر ••
سه‌د په‌رچه کر •
ع ـ ( المشنقة ) •

( سه‌ودا )

کورد ل‌شونا ( آقل ـ عاقل ـ
عقل ) دبێژن :ـ هاڤـــه‌ینێ
عقل دسه‌رێ وي تونـــه •
گلک جارا عاقل وســـه‌ودا
ل‌پـــه‌ي هـــه‌ڤ تێن •
:ـ عاقل وسه‌ودا دســـه‌رێ
م ده نه‌ما • هـــن دبێژن :
( سه‌ودان وآقل ) •
ع ـ ( العقل ) •

( سه‌یدا )

دداباشا ( ساده ـ ســایه ) ده
ده‌رباس بویه کۆ ( ســه‌یدا )
ئه‌وه ئێ کۆ ب‌سایه ـ ب‌ساده
ده‌رسا شاکرتێ خوه کـــاري
بێژي • بێ ( زێر وزه‌بـه‌ر )
ده‌رسا دبێژي •
ع ـ ( الأستاد ) •

## ( سه ـ ئه )

( سه‌ره )

نیڤ‌پیره ـ یا ئێ کۆ بنـــاڤ
سالا ده چویـــه • دبێژن :ـ
ئه‌ڤ گایێ مه ســـــه‌ره یه •
بارام ناڤ سه‌ره یـــه • یاني
نیڤ پیره ـ بناڤ ســــالاده
چویـــه • هـــن دبێژن :ـ
( ره‌ش‌کال ) ـ یاني کاله‌کي
هێ پورێ وي ره‌شه • یـــا
کاله‌کي ره‌شـــه ، هێ پورێ
وي سپي نه‌بویه •
ع ـ ( نصف الکهل ) •

( سه‌ده )

ل‌ناڤ سۆرا بداخوازا ( قرن )

هاتیه چێــكرن • دبێژن :ـ
سەدەیێ دوەم ـ قرنێ دوەم•
ژبەركۆ هەر سـەد سـال
( قرنەكە ) دروستە كـۆ
بێ گۆتن ( سەدە ) • بـەلام
( قرن ) ژكو هاتیه زمـانێ
عربي وكوردي وفارسـي
وتركي نزانم • وا دیارە كۆ
نەعربي یه • ژبەركـــۆ
( قرن ـ قرون ) قوچ ـ قلوچ
ـ ستورەهن •
ع ـ ( القرن ـ قرون ) •

( سەغدە )

ژ ( صدقە ) هاتیه • دبێژن :ـ
بەرە سەغدا سـەرێ تە بي ـ
بەرە صدقا سـەری تەبي •
كورد دخـــوازن گۆتنێ
بێگانە دناف زمانێ خوە دە ب
پشێفن • ئەف ژ زمانـا رە
گەرناسي یەكە مـەزنە •
نەكـۆ دەف خواري یە •
گەرەكە دگۆتنێ خـوە دە
بپێش دە هـــەري • لێ
دگۆتنێ بێگانە دە گەرەكـە
سەروبنێ هەف بكي ودنـاف
خوە دە بپشێفي •
ع ـ ( الصدقة ) •

( سەورە )

ژعربي هاتیه • بسـۆراني
( شورش ) دبي ژ فارسـي
هاتبي • كورمانج ( شەفرەش)
بداخوازا سەربێهاتيیێ گران
دبێژن • هێ ! كورێ مـن !
بافێ ته گلك ( شەفرەش )
دیـنە • ئەگەر ( شورش ) ژ
( شـــەو رەش ) ـ
( شەف رەش ) دەركـەتبي
كوردي‌یە • نەفارسي یە • لێ
راست‌راست شـونا ( ثورة )
ناستێني • بەلام بەرەبـەرە
دكاري بجـارەك جهێ
( سەورە ) بگري • بعربي
ژي ( سەورە ) بـەرێ نافێ
پژقاندنا آفێ وكانـگەها بو ،
لێ بـەرەبـەرە بو نـافێ
لەپ‌هلانینا ملەتا •
ع ـ ( الثورة ) •

( سەوزە )

سەبزە • فارسي يە • هاتيە كوردي • سۆرا ولۆ دبێژن• بداخوازا كەسكە • رەنگێ بنگهي يە •

ع ـ ( الاخضر ) •

## ( سه ـ ئۆ )

( سەبۆ )

سەبا ـ سەبۆني ـ ژبۆ ـ ژبۆنا ـ ژبۆني ـ لەبۆيە • سەبۆ تە هاتمە • ژبۆ تە هاتمە • لەبۆ تۆ هاتمە • ايرە لێ گلك نايێ گۆتن • سەبۆنا ـ سەبۆني زۆر تێ گۆتن •

ع ـ ( لاجل ) •

( سەبتۆ )

پەستاكە كورمانجي ( جمۆ ) دەنگێژێ نافدار ل سەر يەكي جهو چێكريە • ( جمۆ ) مرۆفەكي زمان توژ وبێ شەرم وفهێت بو ، كێ فەنجي پێ نەكرا هێرشێن دژوار دبرن سەر وگۆتنێ پيس دەرحقێ وی دگۆتن • ل سەر ( سەبتۆ ) پەستاكە گلك دژوار وبێ فەدي گۆتيە • لێ مەخابن پەستەيێ ( جمۆ ) نەهاتە نفيساندن • لێ كي وێري فێ بارێ گران هلگري ؟

ع ـ ( هجو لشاعر كوردي شعبي على رجل يهودي)

( سەرگۆ )

تنگە • لێ سەرگۆ ژ تنگ بناڤترە • هەرتەنێ آشيتا دبێژ :ـ تنگ • لێ كورمانج هەمي دبێژن :ـ ( سەرگۆ )•

ع ـ ( المزبلة ) •

## ( سه ـ ئو )

( سەرو )

دارەكە • ئەڤيندار بەژنا يارا خوە وەكە دارا ( سەرو ) دكن ودبێژن :ـ سەرواجوان، سەرواسهێ • ياني يارا كۆ دجوانيا خوە دە وەكە دارا سەروێ يە • يارا كۆ

سیا وێ وەکە سەروێ ، یا
بخوە وەك سەروێ یە .
وێ چاخێ ( سە ) بداخوازا
( وەك ) هاتیە .
ع ـ ( شجرة السرو ) .

**( سەررو )**

بچوکێ وێ ( سەرروك ) .
. ژن ب سەر روێ خوە
دادکن . سەر پۆشە . هن
دبێژن :ـ ( پێچە ) :ـ سەر
روکا خوە بخوە داکە ـ
پێچا خوە بخوە داکە .
روێ خوە فەشێرە .
ع ـ ( غطاء الوجه ) .

## ( سه ـ ئێ )

**( سەروپێ )**

کەلەوپاچە ـ کەلەپاچە .
دفردە چەندان تیسا پێوەند
هەیە ، لێ بویە نافەك ژ
خوارنەکێ رە . لێ د
( کەلەوپاچە ) دە ( و ) رابو
یە . ع ـ ( پاچە ) .

**( سەیرێ )**

نافێ ژنەکە نافدارە. خوشکا
( محمدێ دەروێشە ) کو
لسەر برایێ خوە وەکە
( خنساء ) سترانەکە
بشەوات گۆتیە . سترانا
محمدێ دەروێش گلك
آور و داخوازێن برومەت
وگران‌بها تێ دە خویا دکن:ـ
( مێرکوژۆ ، حەفادۆ دبەر
خەلکێ دە کەکۆ ! ) .
ع ـ ( اسم امرأة کوردیة
رثت أخاها ) .

## ( سه ـ ب )

**( سەب )**

پێلە . دبێژن :ـ سەب
راوەستیایە . یانی هنەك
خوەش بویە . سەرما و باران
نەما تێ .
ع ـ (الظرف) .

**( سەرداب )**

قاتا بن خانییە . هافینا سارە
و رونشتنا وێ خوەشە . لێ
زفستانا آلاف و هور و مورێ
خوە تێدە بجي دکن .
ع ـ (قبوة)

( سەليب )
ئەو دارێ كۆ عيسا پەيغامبەر لسەر بدارڤەكرنە • فلە دخن قرك و گەردەنا خوە •
ع ـ ( صليب ) •

( سەرەنديب )
ئەو جهێ كۆ (آدەم) لـــێ داكەتيە سەر قادێ • گۆيــا ژئەزمانا هاتيــە خــوار ول سەرەنديبــێ داكەتيــيە • خوەدانێ (مەولدا) كــوردي مەلايێ باتي دبێــژي :ــ دەر سەرەنديبێ بأردێ كەت گري گۆيا سەرەنديب ل وەلاتــێ هندێيە •
ع ـ (الارض التي نزل فيهـا آدم) •

## ( سه ـ پ )

( سەرتيپ )
سەردارەكي لەشــكەرە • ژ (تيپ) بداخوازا پەرچــــە ، و(سەر) بداخوازا ســەرەك هاتيە هەڤ • كورمانــــج دبێژن :ــ تيەك سوار هاتن، تلبەك سوار هاتــن • (تيپ) و(تپ) بداخوازەكێ هاتــە • وهارەنگە (تيپ) بداخـــوازا (حرف) هاتيە ، ژبەركـــۆ (حرف) ژي پەرچەنـــــە • وهارەنگــە (تيپ) و( تپتپ ) بداخوازا دەنگ هاتنە • دبـي (تيپ) ژ(تپ) هاتبــي يـــان ژ(تيپ) بداخوازا پەرچــــــە هاتبي • هن ژ كوردێ هێـلا سليمانـــي (پيت) دبێـــژن • دروستە كۆ سەر و بني هەڤ بوبن ، يان ژ(پت) بداخـــوازا دەنگ هاتبي • هەرچاوا بـي (تيپ) و(وپيت) يەك قسەيە ـ يەك پرسە ـ يەك گوتنە• هەردو ژي كوردي نە •
ع ـ (القائد) •

## ( سه ـ ت )

( سەرت )
يا (سرت) بداخوازا هشكە • دبێژن :ــ ئەڤ هاسن سەرتە ، ئەڤ دار سەرتە ، ئەڤ مرۆڤ سەرتە ••• گلك هشكە •

ع ـ (القوى) وعنيد •

( سەمت )

بداخوازا دەر ـ جي ـ شـون
ـ جيگه • دبێژن :ـ لڤـێ
سەمتێ بارێ م کەت • ل ڤێ
سەمتێ بارام هات کوشتن • ل
ڤێ سەمتێ فـەرهاد برین‌دار
بو ••• هەدوەکو دبێرا مـن
تێ بینا عربي ژێ تێ •
ع ـ (مکان) •

( سەبت )

رۆژا سەبتێ بەتلانا جهوایه •
یەک ژ رۆژێ حەفتی‌یێ یه•
بکوردي ناڤێ وێ (شەمه) یه•
ع ـ (یوم السبت) •

## (سه ـ س)

(سەلماس)

باژارەکێ کوردە • دکـەڤي
راژۆرێ کوردستانا بن‌دەستێ
ایـران • ل ژۆرێ گـۆلا
( ئۆرمي ) دکەڤي •
ع ـ (مدینة کوردیة في‌ایران)

(سەمیرامیس)

ناڤێ پادشاهەکي آشورا یـه •
لێ ایرۆ بویه ناڤێ چەنـد
ئۆتێلا ل وەلاتێ عرب بەلاڤ
بویه •
ع ـ (اسم ملك واسم فنادق)

(سەیس)

یا (سایس) ـ ئێ کۆ هەسپـا
خوەدی دکي ـ تیمار دکي •
(میتەره) • کوردێ وەلاتێ مه
(سایس) دبێژن • لێ سەیدایێ
(خاني) دبێژی :ـ
( کەس ناکته میتـەرێ خوە
(جامي)
( راناگرتن کەسەك نظامي)•
خاني ل شونا (سایس) میتـر
آني‌یه • ژلەورا باوەر دکـم
ایراني بي • وهارەنگه عـرب
ژي (دبێـژن) :ـ (سایس) •
سیاسەت ژ ڤر دەرکه تیه •

## ( سه ـ ج )

(سەهریج)

کوردی یە• ژ(سارگه) هاتیه•
آڤسارکه • (سارگه) بـوه
(سارجی) بوه (ساریج) بـوه
(سەهریج) جهێ سارکرنـا

آفێ‌یه • ع ـ (سهريج) •

**(سه‌نج)**

يا (سنج) ژ (سێنج) هاتيـه •
داره‌که بـخێپ و ستری يه •
دبه‌ر سينجا ده‌يه •
ع ـ (شجرة) •

## (سه ـ خ)

**(سه‌رشاخ)**

ئه‌و شه‌به‌شێ کۆ ل ســه‌رێ
شاخا دکه‌ڤن • (شاخ) ترحێ
له‌ما نه • وهاره‌نگه (شــاخ)
ناڤێ گونده‌کي‌يه •

**(سه‌لاخ)**

(گونده‌که) • ل ژێرێ بازارێ
ماردين دکه‌ڤي •
ع ـ (قرية) •

**(سه‌رمساخ)**

گونــده‌کــه • ل چيايــێ
(قه‌ره‌چوخ) و ل سه‌ر ريــا
(ديرکێ) يه •
ع ـ (قرية) •

**(سه‌ماخ)**

دبــي ژ (سماغ) هاتبــي •
(سه‌ماخ) ژبۆ مێرا خورتــي

و خوه‌گرتنه • دبێژن :ـ باراه
ب سه‌ماخه ، ياني زو نارڤي •
د(هاسن) ده • دبێـژن :ـ •
گيسنێ خوه سه‌ماخ کريـه •
ياني ل پاش سۆورکرنــێ
خستيه ناڤ آڤێ • ســه‌ماخا
مێرا و سه‌ماخا هاسن ته‌نێ من
بهيستيه • ع ـ ( •• ) •

## (سه ـ د)

**(سه‌د)**

کارته‌ك ژ هژمارێ يــــه
(١٠٠) • ل په‌ى • نۆتــــي
هاتيه • سه‌دمروڤ ، ســـه‌د
په‌ز ، سه‌د ره‌ز •••
ع ـ ( مأة ) •

**(سه‌د)**

دجوتکرنێ ده بدرێژاهي سه‌د
گاڤه • ياني سه‌د گاڤ درێژي
و ده‌ه گاڤ پاني (سه‌ده‌که)•
ئه‌ڤ ژيى ژ (سه‌د) هاتيـه •
لێ سه‌دا گا و سه‌دا ڤانتــرا
و ســه‌دا ته‌ره‌کتۆرا نه وه‌کــه
هه‌ڤن • سه‌دا گا کن تــره
ژ ســه‌دا ڤانتــرا و ســـه‌دا

ته‌ره‌كتۆرا چقا بخـــوازي دكاري درێژ بكى • ناخـــوه (سه‌دگاف) هه‌ر ته‌نێ ســـه‌دا قانترايه •
ع ـ ( مأة خطوة في الفلاحة )

**(سه‌رسه‌د)**

سه‌رێ‌سه‌دێ يه • كورمانج دبێژن :ـ خوه‌نه سه‌ر ســـه‌دا من و ته ژ هه‌ڤ ڤه‌دگه‌ری ؟ ياني ئه‌م‌نه هـــه‌م ســـينۆرێ هه‌ڤن • هێ سه‌رێ سه‌دێ يه وه‌ره ئه‌مێ بازارا خوه بكن • ياني هێ سه‌رێ بازارێ يه •

**(سه‌رحه‌د)**

وه‌لاتێ (سه‌رحه‌دا ) كوردستانا راژۆره • ژ كوردي و عربـــي هاتيه :ـ (سه‌ر) كوردي يه • و (حه‌د) عربي يه • كوردێ كۆ ل سه‌ر حدودا نه • لـــێ هه‌ر ته‌نێ ژ سينۆرێ راژۆرێ كوردستانێ ره ولۆ تێ گۆتن• ژ به‌ركۆ ل سه‌ر حه‌دێ كورد و روسيا بون • ده‌ما ئـــه‌م دبێژن :ـ خه‌لكێ سه‌رحه‌دا ، داخوازا مه كوردێ سينۆرێ رورسيا نه • دبي دفـــرده پێژنا مسلماني هه‌بي •
ع ـ (منطقة كوردية عـــلى حدود الروسية الكردية) •

**(سه‌رمه‌د)**

نزانم ژكو هاتيـــه لێ سه‌رمه‌د ـ سه‌رمه‌دي ـ بداخـــوازا ئه‌به‌دي ـ ئه‌زلي دزمانێ عربي ده هاتيه • ژ خـــوه‌دێ ره سه‌رمه‌دي هه‌يـــه • جزيري دبێژي :ـ
:ـ (سه‌رمديت وه دڤێتن) نـــه أزل بت نه أبد •

**(سه‌رد)**

گونده‌كه • ل راژۆرێ شارێ (آمه‌د ـ دياربه‌كر) دكه‌ڤێ •
ع ـ (قرية) •

## (سه ـ ز)

**(سه‌رباز)**

سه‌ر له‌شكره ـ ســـه‌رداري له‌شكه‌ره • نو چێ بويه •
ع ـ (قائد ـ ضابط) •

**(سەرفراز)**

سەربلندە • ژ (سەر) و (ئەفراز ـ هەڤراز) هاتیە •
ع ـ (عالی الرأس) •

**(سەرگەڤاز)**

من بهیستیە بداخوازا سەردار ـ سەرباز هاتیە • لێ (گەڤاز) نزانم ژ کوها تیە ؟ دبي چێکري بي • نو هاتبي چێکرن •
ع ـ (بمعنی القائد) •

**(سەوز)**

سەبزە ـ کەسکە • ل سەر رێچا (حەنەفي) دلێژێ دە ـ دنمێژێ دە دروستە ل شونا (مدهامتان) کۆ آیەتەک ژ (قورآنێ) یە • بێ گۆتن :ـ دو بەرگێ سەبز ـ دو بەرگێ سەوز • یاني دروستە ب فارسي وکوردي آیەتێ (قورآنێ) بێنە خوەندن • ئەز (کوردی) زیدە دکم ژ بەرکۆ دناڤبەرا گۆتنا :ـ (سەبز) و (سەوز) دە هیچ فەرقي نیە • ع ـ (أخضر) •

## (سه ـ ر)

**(سەردار)**

بداخوازا فەرماندارە ـ حاکمە ـ مەزنە ـ سەرداریێ لەشکەر ـ سەربازە ـ سەرلەشکەرە • سەرداریێ وەلێت • فەرماندارە ـ حاکمە ـ پادشاهە • سەرەکە • یاني ئێ کۆ دار ددەستێ وی دە یە •
ع ـ (الحاکم والرئیس) •

**(سەردار)**

دەما ئەم داریێ دبرن ، ژبۆ فرۆتنێ دکن (٣) سێ پەرچە :ـ سەردار ، ناڤدار ، بندار • سەردار ژ هەڤالێ خوە آرزان ترە • ژبەرکۆ ژ هەڤالێ خوە زراڤ ترە •
ع ـ (رأس الشجرة) او المقطع الاعلی منها •

**(سەربار)**

ئەوە کۆ ل سەر باریێ خوە دکن • دەما دچن آشا ، یا

کەروانی تورەکي ل سەر بارێ خوە دکن • هەروەکو خویا دکي ژ بۆ کۆ سەوالا وی ئەگەر جارەك نکاربي بارێ خوە بگهێني قوناخێ کەرآژۆ دکاري سەربار هلگري آریکاریا سەوالا خوە بکي • هەروها دبي سەربار وبار نە یەك بن ، یا نەئێ مالەکێ بن •

**(سەرکار)**
ئەوە کۆ کارێ مارلدارەکي بگەرێني • دەولەمەندك هەیە کۆ چەند گوندێ وي هەنە مرۆفەکي ب سەرکاري دگري و موچەکي باش ژێ رە فەدبري و داتێني سەر کارێ خوە جا ئەو مرۆڤ بگری ، بەردي هەمو ددەستێ وی دەیە • ئەم ژفي مرۆفێ رە دبێژن :ـ (سەرکار) •
ع ـ (المدير) •

**(سەروەر)**
مەزن و سەرەکە •
ع ـ (الرئيس) •

**(سەفدەر)**
نافێ مرۆفەکي یە • ئێ کۆ (صفی) دژمن ددرێني • ژ عربي و کوردي هاتیە • (مفدرین)ە •
ع ـ (من يشق صفوف العدى)

**(سەفار)**
(سپیکەرە) ـ ئێ کۆ فراغ و سفرێ گوندیا سپي دکی • ژ عربي هاتیە • لێ ئەگەر (سفر) نەعربي بي ، (سفار) ژي نەعربي یە •
ع ـ (صفار) •

**(سەنجەر)**
نافێ مرۆفەکي نافدارە • سەنجەرشاە سەلجوقي یە • لێ ژ بەرکو ل بازارێ (سەنجارێ) شەنگالێ چێبویە نافێ وي کرن سەنجەر • ل پارچاك ژ کوردستانێ فەرمان داری کریە •

**(سەنجار)**
شەنگالە • چیایێ شەنگالێ

دكوردستانێ ده بده‌نگــه • گلكى ديلۆك وستران ل سه‌ر هاتــه گۆتــن • (لاوكــێ شه‌نگالي) گلك ب شه‌وات و خوه‌شن • ب هزيرێ خوه و لاوكێ خوه ناڤداره •خه‌لكێ شه‌نگالێ كوردێ ايزيدى‌نه • بميراني ده‌نگ دانه • دبي ژ (سه‌نگ آر) هاتبي • يانــى كه‌ڤرێ آگري • كه‌ڤــرێ شه‌نگالێ براستي ب آگرن • هه‌روها دبي ژ (شــه‌نگ آل) هاتبي :ـ (آل) به‌يــره‌ق • و (شه‌نگ) جوان •

ع ـ (معروف) •

**(سه‌ور)**

يا (سته‌ور) بازره‌كـــه • ل راژۆرێ بازارێ (مارديــن) دكه‌ڤي • مالا ميرێ سته‌ورێ ناڤدارن لێ نزانم ژ چه مالباتێ نه • ع ـ (مدينة كوردية) •

**(سه‌رچنار)**

ناڤێ گونده‌كى يه • ل هێــلا (سليمانى) دكه‌ڤي •

## (سه ـ ش)

**(سه‌رخوه‌ش)**

مرۆڤێ كۆ عره‌قێ ڤه‌دخــوي و سه‌رخوه‌ش دبي • يانــي سه‌رێ وى خوه‌ش دبــي • كێف خوه‌ش دبي ـ مه‌ســت ودل‌خوه‌ش دبي • جارنا دل شاده و جارنا مه‌سته • ئــێ دل‌شـــا ـ دل خـــوه‌ش سه‌رخوه‌شه • ئێ ده‌ما كــۆ مه‌سته ناڤێ وى سه‌رمه‌سته • نه سه‌رخوه‌شه •

ع ـ (خمار) •

**(سه‌رائێش)**

نه‌خوه‌شي يه‌كه‌ •هن دبێژن:ـ باهۆر • وهن دبێژن :ـ آرسم •••• لێ سه‌رائێش ژهــه‌مــو نه‌خوه‌شـــي‌يێ كۆ ســه‌رێ مرۆڤ پێ تێشي ره تێ گۆتن• وێ چاخێ نه ناڤه • به‌لكـــێ په‌سنه‌كه ـ په‌سناڤه •

ع ـ (الزكام) •

**(سه‌رپۆش)**

ئه‌و تشتێ كۆ ژن و مێر ددن

سەرێ خوه • بۆش ـ پۆشاندن نخوماندنه داپۆشینه• (سەرپۆش) ئەوێ کۆ سەر دادپۆشي ـ د نخومێني • ڤەدشێری •

(سەرقۆش)
قایشەکە ، یا بەنەکە • ژ پاش‌ڤە بکورتێن گرایداي و هەردو سەری بقوشێ‌ڤە گریداي نە داوەکو قۆش نەکەڤي ناڤ ایشکێ سەوالێ• کەروان ڤان دزانن •
ع ـ ( ••• )

(سەرگۆش)
بەنەکە ، یا زەنجیرەکە ب هەڤسەرڤە یە دخن پاش گوهێ هەسپ وسەوالێ سواربونێ ئێ بەنکي بخەمل و خێز و رەوشە ، بگولک وگولابەندە • ئەڤ سەرگۆش پەرچێ زۆري ژ هەڤسەرە•

(سەواش)
هاوار وقێرین و هەيهەی یە • جزیري دبێژي :

:ـ ( سەواش وهەيهەي وقێرین ) • لێ ئەڤ سەواش نە کوردی یە • نزانم ژکو هاتیە • دبي فارسي بي •

## (سه ـ ق)

(سەق)
بەروا مەزنە • کورمانج دبێژن :ـ سەقە ل گۆرا حەقە • وا دیارە بەرێ بەرو دهاتن کرین و فرۆتن • ژ لەورا ئەڤ گۆتن هاتیە گۆتن •
ع ـ ( الكبير من البلوط ) •

## (سه ـ گ)

(سەگ)
سەهە ـ کوچکە • فارسي و کوردی یە • سۆری ولۆ دبێژن • سە ـ سەهـ ـ سەگ • هەمو بداخوازا کوچکە • کوچگ ـ تاژی ـ تولە • بچوکێ وان جەورە بجوکێ ( جەور ) جەورکە • لێ ( جەور ) ژ بۆ زارۆکێ

شێرا ژی تێ گۆتن • گـور ژي تێدە پایدارە •
ع ـ ( الـكلب ) •

(سەرسەنگ)

جهەكي خوەشە • ل راژۆرێ موصل دكەڤي • پایزگەهـا پادشـاهێ عراقێ بو • دكوردستانێ دەیە • لـەناڤ بەهدینا یە •
ع ـ ( مصیف الملك بسرسنگ )

(سەرهەنگ)

فارسي‌یە • ( قائد ) •

## ( سە ـ ك )

(سەرك)

دقالونێ دە ( سەرك ) جهێ كۆ توتنێ دخنێ • ل گوندێ مە ژ كیلێ چێدكن • ژ سەر هاتیە • بچوكێ سـەرە • سەرۆك ـ سەرەك وەكـە هەڤن • لێ ( سەرك ) ژبۆ بچوكی هاتیـە • بـەلام ( سەرەك ) ـ ( سەرۆك ) ژبۆ بێتری هاتنە •

ع ـ ( الراس ) تصغیر الرأس

(سەلك)

ژشـفێ بي و ترحێ دار چێدكن • بچوكێ ( سـەنە ) لێ بهنا عربي ژێ تێ •

(سەفك)

هەیوان و آڤانیـا پێش مانێ یە • هاڤینـا لێ رودنن ـ دادنشن ، و زڤستانا تێمێ پەز تێدە داتێنن • هن دبێژن :ـ هێوان •
ع ـ ( الصالون ) •

(سەرپل)

ناڤێ شونەكـە • ل راژۆرێ شارێ ( هەولێر ـ أربـل ) دكەڤي • ( پـل ) دزارێ سۆري دە بداخوازا كەڤرە • بكورمانجي ( پەلە ) كەڤرەكي نیفچەیە •
ع ـ ( مكان شمال اربیل ) •

(سەرپێل)

مرۆڤێ كۆ سـەرێ وی دبەردەیە • یاني كێم غیرەت

بەرخوە ناكەڤي • ژخـــوە
فەدی ناکي ژخوە شەرم ناکي
ع ـ ( الحقير الذي لا يرفـع
رأسه من الخجل ) •

**(سەرسال)**

چەژنەکە کوردي يـــە • د
سەرێ کانونا دووم دەيە • د
وێ شەڤـێ دە کوردســـتان
بجـــارەك دناڤ شـــادی
وخوەشي دە دمێني • خۆرت
( قردك ) چێدکن و مال ب
مال دگەرن پـەرا ژخـــوەرە
دستێنن • ( قـردك ) ژن و
مێرەك ژخورتا چێدکـــن
بخەمل وخێز وگۆڤەنـــد
وديلان لناڤ گوند دگەرن •
شەڤ پێدە بدل خوەشـــي
وکەن وشادي دەرباس دبـــي
د ما دکەڤن هندرو زارۆکـێ
بچوك دترسن ، درەڤن •
لێ بوك وزاڤا ديلانێ دکـن
وخێلي دبێژن :ــ سەرێ سالێ
بنێ سالێ خوەدێ کورەکـي
بدی کەبانيا مالێ •

ع ـ ( عيد رأس السنة ) •

**(سەوال)**

دەوارن • گلك جارا پـــەز
و دەوار بهەڤرە دکەڤن بن
ناڤێ سەوال • لێ جارنـــا
لپەی هەڤ تێن :ــ پـــەزو
سەوال • سەوال ـ ( حيوان )
ئێ کەدي نە •
ع ـ (الحيوان الاهلية) •

**(سەويل)**

کۆیێ آڤێ يە • ژبۆ زارۆکـا
سەويلك هـــەنە • بچوکێ
سەويلە • هن دبێـــژن :ــ
شەربك ، وهـــن دبێـــژن
کوزك •
ع ـ (جرة صغيرة او تونگە)•

## (سه ـ م)

**(سەرم)**

دهەمبەر (گەرم) دەتێ • سەرم
ـ ساري يە • سەرم ـ سەرما
ـ سەرمي • دهەمبەر گـەرم
ـ گەرما ـ گەرمي دە تێ •
سەرمايی ـ گرمايی دهەمبـەر

هەڤ دە تێن • (سر) بایێ
سارە ـ ساردە •
ع ـ (البرودة) •

**(سەرسەم)**

مرۆڤێ دین ـ شێت و
مێخۆلی یە • ترك وفارس
وكورد بهەڤرە ولۆ دبێژن
ترال وبێ كێر وتەوتەوەیە •

**(سەنەم)**

پوت ولاتە • عرب ژی
دبێژن :ـ صنم ـ ( اصنام ) •
لێ نەعربی یە • نزانم ژكو
هاتیە • (سنماندن) لجهم مە
پیس كرن ـ حرماندنە •
دبێژن :ـ كوچكێ سنماندیە•
ع ـ ( الصنم والاصنام ) •

## (سە ـ ن)

**( سەردان )**

چونا شون مریایە • دەما
یەك دمری خەلك دچن
سەردانا وی • براستی دچن
سەردانا مرۆڤێ وی • هن
دبێژن :ـ شون • دبێژن :ـ
ئەم ژ سەردانا بارام تێن یانی
چوبونە مالا بارام مەسەرەك
دابو مرۆڤێ وی ژبۆ
دلخوەشی وسەرخوەشی •
هن دبێژن :ـ • ئەم چوبونە
سەرخوەشیا مالا بارام •
ع ـ (التعازي) •

**( سەروخان )**

یا صاروخان • ئەگەر
( سەروخان ) بی كوردی یە•
ژ(سەرو) دارەكە • و(خان)
جی‌یە خانی‌یە • لێ ئەگەر
( صارۆ خان‌بی ) تركی‌یە •
( صارۆ ) نزانم چیە • لێ
خان بدخوازا مەزنە • دبی
( صارۆ ) نافەك بی • هن
دبێژن :ـ (سارخوان) • مالا
سارخوانێ حەمكۆ • مالمەزن
واغایێ ائێلا گولكا بون •
( ساروخان ) كورێ سەرحان
آغایێ ائێلا هەڤیركا بو • بویە
نافەكی كوردی ول وەلاتێ
مە بلاڤ بویە •
ع ـ (اسم رجل) •

( سەرحان )

باقێ(سارخوان) آغایێ هەفیرکا بو•سەرحان وچەلەبي بدەنگ بون •

ع ـ (اسم رجل) •

( سەرزەهان )

چێکرییە • (چاویش) یا (ئونباشي) یە •

ع ـ (الرقیب) •

( سەرکان )

سەرکان عشیرێ مالمەزنا ائلێ یە • یانی سەرێ کاني دناڤ ائلێ دە سەرێ کانیا ائلێ • یاني کۆوك وبنیادا ائلێ •

ع ـ (أساس العشیرة) •

( سەرمیان )

دبێژن :ـ مالا بارام سەرمیانێ ائلێ نە • یاني مەزنێ ائلێ نە (مەیان) مالە ـ تشتێ کو لجەم تە کۆم بویە ـ گهایە هەڤ • دبێژن :ـ ماستێ من میایە ـ یاني گهایە هەڤ •

سەرمیان ـ (رأس المال) •

سەرمیانێ ائلێ مالا چێیە ـ مرۆڤێ باشە • کورد گۆتیە:ـ بەرە مالەکە بێ خوەدي بي نەائلەکە بێ سەری بي • راستە ئەگەر مال بێ خوەدي بي ائل کاري خوەدی بکي لێ کۆ ائل بێ سەری بکي کاري لهەڤ راگري •

ع ـ (زعیم العشیرة) •

( سەروان )

سەروانەکە • دەرباس بویە سەروان یا سەروانەك شڤانێ دەڤایە •

ع ـ (راعي الابل)•

( سەگڤان )

نێچیرڤانە ـ راوکەرە • ئێ کۆ ب سەگا نێچیرێ دکي • ژلەورا بویە (سەگڤان) یاشێ بویە ناڤێ وی مرۆڤێ کو ل نیشانێ دخي • یاني گلك نیچیر کریە تا کۆ بویە نیشانڤان • عربێ وەلاتێ مە دبێژن :ـ سەگمان ـ یاني

مرۆڤێ ژێهاتــي ـ مێــــر وگەرناس •
ع ـ ( الصياد ) •

( سەیوان )
یا (سيوان) • کورمانـــــج دبێژن :ـ بوسي وسـيوان • یاني ئەو تشتێ کۆ ســي ددي سەرمرۆڤ •
ع ـ (شەمسية) ـ المظلة •

( سەیران )
گەشته • لێ ل ناڤ کورمانجا گەشت وسەیران ل پـــەی هەڤ تێن :ـ
:ـ گەشت وســـەیرانه لێ ل بنیا ڤێ دارێ ••••
ع ـ (النزهة) •

## (س ـ آ)

( سبا )
ژسپیده هاتیه • یاني دەمـــا کۆ دبي رۆژ • هــــــن دبێـــژن :ـ ئەســـپیده ـ رۆناهيیه • داویا شـــەڤێ و سەرێ رۆژێیه •
ع ـ ( الصباح ) غدا •

( سلیڤا )
ائێلەکه کورده • ناڤــداره ل هێلا باژارێ (فارقین) دکەڤێ•

## (س ـ ئه)

( سبه )
یان (سبەه) ژسـپیده هاتیه • بداخوازا شەفەقه •
ع ـ (الصبح) •

( سپه )
تەباکي هـــــورك ویسه • دکەڤێ لاشێ مرۆڤا • هـــن دبێژن :ـ سبي •
ع ـ (القمل) •

( سپیده )
بداخوازا شەفەقه • اســـپیده ژی هاتیه گۆتن •
ع ـ (الشفق) •

( سره )
دۆره • دبێژن :ـ هێ ســـرا ته نەهاتیه ـ دۆرا ته نەهاتیه •
(ترك) ژی دبێژن :ـ (سره) لێ ژکوردي وفارسي دزینه • ژبەرکۆ ( سەر ) هەرکەس

دزاني نه تركي‌يــــه • دۆر ژ
سه‌رى ڤه دگه‌رى ژله‌ورا ناڤێ
وێ بويه (سره) يان (ســه‌ره)
ژبه‌ركۆ (سه‌ره) بداخـــوازا
مه‌زنه بويه (سره) • يانـــي
سه‌رێ ژمارێ يا دۆرێ هـێ
نه‌گهايه ته •
ع ـ (الدور) •

( سفره )

يان (سفرى) • (خوانه) يه •
ئه‌و به‌رگ يا سێنيا كـــۆ
خوارنێ ل سه‌ر داتێـــن •
ئه‌گه‌رژ (صفـــر) هاتبـــي •
( سفري ) بێتر راسته •
ع ـ (الصفرية) •

( سركه )

وه‌كه ترشي‌يه • ژآڤا تـــرى
چێدكن • يا كه‌شمولێ تـــرى
دخن ناڤ ترشي دبي‌سركه •
ع ـ (خل) •

( سله )

يا (زله) يا ( سيله ) لێ دانـا
بده‌سته • دبێـــــژن :ـ بارام
سلاك ل فه‌رهاد خست ،يانى
بده‌ستێ خوه شـــه‌قامه‌ك ل
روێ فه‌رهاد خست •
ع ـ ( ضرب الوجه بالكف )

( سرمه )

ژ سيم و قه‌يتانێ بسيـــــم
چێدكن • سرمه زه‌ر هه‌يـه
و سپي هه‌يه • چۆخـــــێ
بسرمه • عه‌با بسرمه ، شال
وشاپكـــێ سرمه‌كـــري •
دسترانێ كـــوردى ده گلك
هاتيه • ( سيم ) •

( سفرنه )

ل سه‌ر قراغێ خاني سفرنـه
چێدكن • داوه‌كـــو آڤ ب
ديوارا ده نه‌چـي خوارێ •
سۆرا دبێژن :ـ سفه‌نــده :
په‌سته‌يه‌ك سۆراني هه‌يه :
: ـ له سفاندا له سفاندا هلگر
وه باناندا
له سفاندا له سفاندا گه‌زه‌ك
له رۆخان دا •••

( سخمه )

كه‌له‌م وخيه • سه‌ر توژه •

( سنه )

نافێ بازارێ (سنەندوجـه) • شارێ (سنه) پايي تەختـــا كوردســـتانا ايرانـــي يـــه • دايـــرۆده دەزگێ راديـــۆ بكـــوردي سەرێهاتيا بـەلاف دكي • ل ايرانێ (ه) دەزگـه بكوردی سەرێهاتي وسـتران و ديلۆكێ كوردی بەلاف دكن لێ هيچ يەك دابلشا پەريشاني وبندەستي‌يا ملەتێ كورد ناكي ناهێلن كورد بزمانێ خوه دل وەلاتێ خـــوه بـنفيســـن و بـخوێنن ؟

ع ـ (مدينة كوردية) •

## (س ـ ئي)

( سي )

سي‌بەره • سيا بارام دايه سەر مرۆڤێ وی ـخێرا بارام گهايه مرۆڤێ وی • سيا دارا دا سەر مه • ناف داره • ( سيوان ) شەمسي‌پەره • شەمسي يه •

ع ـ (الظل) •

( سي )

بداخوازا (۳۰) ســيه هاتيه •

( سپي )

رەنگەكه :ـ سۆر ـ كەسكـ زەر ـ رەش ـ ســـپي ••• (سپي) هـــەروەكو دەرباس بويه بداخوازا سپه هاتيـــه • سپي هاتنه ناف پۆرێ من •

ع ـ (البياض) •

( ستي )

(ستيا زين) ناف داره • جاوا خاني دبێژي (ستي) خوشكـا (زينه) و ژنا (تاج الديـــن) • لێ كورمانـــج دبێـــژن :ـ (ستيازين) ئەگەر ولۆ بي ستي دبي پەسنێ ( زين ) •

ع ـ (اسم امرأة) •

( ستری )

خيپ و كلەم و قونچـرن • ســـەرتوژن وەكـــه دەرزی دلاشێ مرۆڤ رادبن •

ع ـ (الشوك) •

( سستي )

گەوشەكي يه • ددژمناهي‌ده

فسەکی‌یە • نەوێري راست راست خوە ئەشکەرا بکی • وەکە مرۆڤێ دبن خوەدە فسا بکی زلەورا دبێژن :- (فسەکي) •

( سرتي )

هشکي و دژواری یە • د (سەرت) دە دەرباس بویە •

( سنجي )

دەرباس بویە • دارەکە دسنێۆری آڤیا دە دچێنن بستری‌یە •

( سندی )

ایلەکە کوردە ل رۆژێ بازاري (موصل) دکڤی • چێرۆکا سلیمانێ سندی ل وەلاتێ مە ناڤدارە •
ع - (عشيرة كوردية) •

( سني )

رێجەکە مسلمانا یە • دەمبە (شێعي) دە هاتیە • عربي‌یە •

( سپەهي )

جواني و رندی وچەلەنگی یە • دبێژن :- رەوشێ گلک سپەهي یە • زۆر جوانە • (جوان) بکورمانجی دەمبە کال - پیر دە هاتیە :- بارام جوانە - نەپیرە - نەکالە • (جوانی) خۆرتانی یە - گەنجي‌یە • گەنج ترکي یە •
ع - (زين او حلو) •

## (س - ئێ)

( سێ )

بداخوازا (٣) هاتیە • سێ جار ، چار جار ••• کورمانج جارنا دبێژن :- س‌سێ ، ددۆ :- یەک - ددۆ - س‌سێ • لێ ئەڤ نەراستە • وەکە سۆرا دبێژن :- یەک - دۆ - سێ • بتیر خوەش وراستە •
ع - (ثلاثة) •

( سی‌سێ )

جارنا کورمانج دبێژن :- ددو - س‌سێ • لێ نەراستە • ژبەرکۆ (دودو) بداخوازا

(٤) تێن • و س‌سێ بداخوازا

(٩) تێن • دفرده :ـ یه‌ك ، دۆ ، سێ ••• چاكه •

ع ـ (ثلاثة) •

( سدێ )

ریسێ كۆ دكن (جومكــێ) دخوازن بكن جاو • هــن دبێژن (سدی) وهن دبێژن :ـ (سدێ) لێ نزانم ژكو هاتیه • ته‌نێ عرب ژی ولۆ دبێژن :ـ (سدێ ولحمێ) •

( سنێ )

داره‌كه ب نه‌وقا ته‌با ڤــــه گرێددن داكۆ ده‌ڤێ خــــوه ناڤێژن برینا خوه • دبێژن مه قانترا خوه خه‌سانـــدی‌یه • دبێژي : سنێ بكه داكــــۆ ده‌ڤێ خوه ناڤێژی برینا خوه• ب نه‌وقا وي وقرکا وی ڤه دو به‌نا گرێددن و داره‌كــــي ب‌هه‌ردو به‌نافه گرێــددن بڤی آوای نكاري ده‌ڤێ خــــوه باڤێژی برینا خوه • ع (••)•

## (س ـ ت)

( سست )

ئه‌وێ ناخوازی كاره‌كــــي ب خورتي و ب‌له‌ز و به‌ز بكي • دبێژن :ـ بارام سسته نكاری یا ناخوازي ژدل كاره‌كــــي بكي •سستی ژێده‌رێ وێ یه• ده‌هه‌موا ده سستي گه‌وشه‌كی یه • ع ـ (الرخو) •

( سرت )

بداخوازا هشك هاتیــــه • وهاره‌نگه (سرت) چیاین كــۆ ده‌ڤه‌رێن كور تێ‌ده هه‌نــه • سرتا گۆلێ ل ناڤ ئۆمه‌ریـــا ناڤ‌داره • وا دیاره‌كۆ ســرت ئه‌و ده‌ڤرێن (سر) ـ با تــێ‌ره تێ • جهێ كۆ سر تێ‌ره تێ• ع ـ (خلاء بين الجبلين) •

( سفت )

بداخوازا ساده یه • دبێــژن بارام سفتي دینه • یانێ ساده دینه • ع ـ (بالمرة) •

( سپاس )

شكره • ژشاباش هاتیه •

## (س ـ س)

( سوێس )

قەنال سوێس ناڤداره • ل مصری یه • (سوێس) بخوه باژاره‌که • ل سەر قەناله• ئەڤ قەنال دەریا سپی و دەریا سۆر دگهینیی هەڤ •

ع ـ (سوێس) •

## (س ـ ج)

( سروج )

باژاره‌کی کوردستانێ بچوکه• ل رۆژ آفایێ باژارێ ( رها ـ ئورفا) دکەڤی • دەشتا سروجێ ناڤداره ، ایلا بەرازا تێدەنه •

ع ـ (مدينة كوردية) •

( سنج )

دەرباس بویه • هن دبێژن :ـ (سەنج) و هن دبێژن : (سنجي) • داره‌که ل هاویر آڤیا دچێنن •

ع ـ (قد مر ذكرها) •

## (س ـ د)

( سرود )

سۆرانی • ژفارسی هاتیه • شەرقی نه ـ خوشخوانه •

ع ـ (أناشيد) •

( سیامەد )

چیرۆکا سیامەد ناڤداره •

ع ـ (القصة الفلسفية الرائعة)

## (س ـ ر)

( سر )

باکی سڤک و ساره •دبێژن:ـ سرا بێ تێ • یانی باکی سڤک و سار تێ • دسترانا ، ده هاتیه :ـ سبەیه سرا بێ تێ •• ع ـ ( نسیم الصباح )•

( ستور )

بداخوازا ڤالنده • دهەمبەر زراڤ ده هاتیه • بەژنا تە زراڤه • بەژنا وی ستوره • ئەڤ دار زراڤه ، ئەڤ دار ستوره •

ع ـ (الغليظ) •

( سپیدار )

ناڤێ شۆخێ یه • ژبەرکو سپی یه • بویه (سپیدار) •

ع ـ (الحور) •

**( ستێر )**

یا (استێر) •

ع ـ (النجوم) •

**( سکەندەر )**

نافێ قەرالەکی مقدۆنی یە •
هن دبێـــژن :ـ (اسکەندەر)
خانی دبێـــژی :ـ (بافێ وي
دبێژنێ سکەندەر لێکن عربـا
دگۆ غضنفر) سکەندەر بافــێ
قەرەتاژدینە گەرناسێ برومەتێ
چیرۆکا (مەم وزین) • کـــۆ
مالا خوە دبەر هەڤالێ خوە دە
شەوتاندی یە •

ع ـ (اسم رجل) •

**( سلندر )**

نافێ آلافەکي ئۆتۆمۆبیلایە •
بارگراني هەمو ل سەرە •

ع ـ (سلندر) •

**( سنگر )**

نفشەک زمەکینێ درونێ یە•
گرانبهایـــە ، نـــافدارە •
بەلاف بویە • ئەوروپي یە لێ
بویە تەڤایي •

ع ـ (سنگر) ـ (سنجر) •

**( سنەوبەر )**

دارەکە نافدارە بێ بەرە •
وەکە (دل) تشتەک لـــــێ
دکەڤي لێ نایێ خوارن •

ع ـ (صنوبر) •

**( سوار )**

دهەمبەر پـــەیا دە هاتیـــە •
(پیاو) ژ پەیا هاتیە • سوارە ـ
نە پەیا یـــە • ( ســـوارۆ )
سترانەکە کورمانجی یـــە •
دقاوانا دە هەیە •

ع ـ (الفارس والخیال) •

**( سلاڤ )**

ژعربي هاتیە • ســــلاوە •
رۆژخوەشي یە •

ع ـ (السلام) •

( سلق )

یا (سلک) بنێ گەیاکــــي
نافدارە شێرینە ، ســۆرە •
گەیایێ سلکێ دکـن ( پەل )
ئەپرەخ • هن دبێـــژن : ـ
سلکەسۆر • دبن رێچـــال و
ترشي • ع ـ (السلق) •

( سماق )

ل ناڤ رەزا ، ل چۆلێ چێ دبي • بەرێ وێ سۆر وهور وترشه • ع ـ (السماق) •

( سنگ )

دارەكي سەر توژە • دخن ديوارا و دكۆنا دە دخن قادێ و شەريتا پێ گرێدن • كورمانج دبێژن :ـ سنگ ژبەر مێكوت دچي خوار •
ع ـ (الوتد) •

( سڤك )

چاپك ولەزە • دبێژن :ـ بارێ مە سڤكە ـ نەگرانە • سڤك وەرە • چاپك وەرە • بلەز وەرە • وهارەنگە ( سڤك ) بداخوازا نەگران هاتيە • دهەمبەر گران دە هاتيە • بارێ تە سڤكە ـ كوفلەتێ تە هندكە •
ع ـ (السرعة والخفة) •

( سوێرەك )

بازارەكي كوردە دكەڤي رۆژ ئاڤايێ (دياربەكر) •
ع ـ (مدينة كوردية) •

## (س ـ م)

( سم )

تە بايێ بسم وەكە هەسپ ، قانتر ، كەر ، گا ••• سمێ گا دو پەرچەنە • وسمێ هەسپا وقانتر وكەرا يەك پەرچە نە • (سمتەراش) ئێ كۆ سما دتەرێشي ـ دبري • ژئێ دەڤارە دبێژن :ـ تاپان • ژئێ شێر وگور وكوچك •• رە تێ گۆتن : (پەنج) • ژئێ مرۆڤا رە دبێژن :ـ دەست وپێ •••• ع ـ (الحوافر) •

( ستەم )

زۆركەري وهلوەشاندنە • گلك دبێژن :ـ زۆر وستەم• خاني ستمي هلوەشيا ، وێران بو • نفرا ل هەڤ دكن و دبێژن :ـ وەي مالا نە بستەمي ! ستەمكاري زۆر وزولمە•(ستەمكار) زۆركەرە• (ستەمبار) ئێ كۆ ستەم لێ

دباري • ستەم وستەمانــدن
ژێدەرن • ع ـ (الظلم) •

**( سیەم )**

روتباكە ژمارێ یە • سیەم ـ
چارەم ••• سیەمین ژي هەیە
ـ سێمە ژی تێ گۆتن • سێمە
ـ چارمە ـ پنیجمە •••
ع ـ (الثالث) •

**( سیام )**

وەلاتەكە • ل هندێ چینــي
دكــەڤي • پایتەختــا وی
(بانگۆكە) • ع ـ (سیام) •

## (س ـ ن)

**( ستران )**

لاوكــێ وشــەر ولاڤیــژ
وبەردۆلابي نە • گۆراني یە•
ستران بێژ ئێ كۆ سترانــا
دبێژي • هــن دبێــژن :ـ
سترانڤان • گۆرانبێژە • هن
دبێژن :ـ دەنگبێژ • پەســتە
ناكەڤن بەر سترانێ وهارەنگە
دیلــۆك ژي ژبــەر دەر
دكەڤن • ع ـ ( الغناء )

**( ستان )**

ناڤێ جیگەهــي یــە • یان
آلاڤەكە پێ جي چێ دبــي
وەكــە :ـ كوردســتان ـ
هندستان •• گولســتان ـ
بۆستان •
ع ـ (اسم مكان كوردی) •

**( ستون )**

ژدار وكەڤر وهاسن چیــێ
دكن • ستونێ هاسني دشەردە
وددەێ بۆری‌دە چەكەكە شەر
بو • دكونا دە ، دخاني‌یــادە
ســتونا دار ددن بــن دار
وبەشتا • دآڤاني‌یێ مەزن دە
ژكەڤر وجمەنتۆ چێ دكن •
ع ـ (العامود) •

**( ستاندن )**

گلكك جارا تێ دە بهنــا زۆر
وخورتي هەیە • دبێــژن :ـ
سەرخوەبونا خوەستاندن ماڤێ
خوە ستاند • جارنا بداخوازا
وەرگرتن هاتیە :ـ ســتاند ـ
وەرگرت • ع ـ ( الاخذ )•

( ستماندن )

دەرباس بويه • هلوەشانـدن وويران بونه ـ وێران‌كرنه • ع ـ (الظلم او الهدم) •

( سمتن )

كون كرنه • بـەرێ تفنگێ سينگا بارام سمتي يه ـ كـون كريه ـ قول كريه • ع ـ (خـروج الرصاص او المثقب من طرف الى طرف) •

( سەنماندن )

دبێژن :ـ كوچكێ ماستێ مـه سەنماندیـیـه • ( حرام ) كريه ـ نەجس كريه • ع ـ (النجاسة) •

( سندیان )

هاسنكي گران و آسێ يـه • هاسن ل سەر پان دكـن • ژمێرێ چێ ره دشـەرا ده دبێژن :ـ بويه سندیان • هن دبێژن : ـ (سندان) •

( سەودان )

دەرباس بويه • بداخـوازا (آقل) وهوشه •

( سپاه )

لەشكەره • فارسي يه لـێ گلك دشعرێ كـوردي ده هاتيه • دبي ژ سپەهي ـ جوان ـ رنـد هـاتبي وێ چاغێ كورديه ، نەفارسي‌يه • ع ـ (الجيش) •

( سياه )

رەشه • كوردي وفارسي‌يه • بسكێ سياه ، زلفـێ سياه • گلك ددیوانێ كـوردي ده هاتيه • ع ـ (الاسود) •

## (س ـ آ)

( سيمنسا )

وەكه (سيمن) سيمن گولەكه، يا سيمه ـ سورمەيه • وەك زيف ـ وەك سيم • ع ـ (اسم امرأة) •

( سيحا )

گوندەكـه • ل زێـرێ رۆژهلاتێ قامشلۆ دكـەفي • مالا ( ئەحمـەدێ ئوسف )

خوەدیێ گوندن •
ع ـ (قرية) •

**( سيرا )**
ناڤێ هەمبارەکێ یە ـ شرکەتەکێیە • رادیۆ سیرا ـ تەلەڤزیۆن سیرا ل هەر دەر بەلاڤ بونە • ئەوروپیێیە •
ع ـ (شركة سيرا) •

**( سيپكا )**
ائیلەکە کوردە ناڤدارە • ل وەلاتێ سەرحەدا بکەڤي • عبدالمجیدبەگێ سیپکی ناڤدارە •
ع ـ (عشيرة شمال كوردستان تركيا) •

**( سينما )**
ناڤ دارە • دکۆکا خوەدە (سي‌نما) یە • یاني سيیا مرۆڤ ئەشکەرا دکي ـ دڤردە (سي)ـ (تەسویرە ـ تصوير)• لێ وا دیارە ژ ئەوروپا هاتیە •
ع ـ (سينما) •

## (سي ـ ئه)

**( سيله )**
سله ـ زله ـ شەقامە • لێ دانا بدەستە • دەرباس بویە •
ع ـ (الضرب بالكف) •

**( سينه )**
سنیگە • دشعرێ دە تێ • دبي فارسي بي •
ع ـ (الصدر) •

**( سيگه )**
جهێ کۆ (سي) لێ هەیە • (سي گە ) ـ جهێ سيلێیە•
ع ـ ( مكان الظل ) •

## (سي ـ ئێ)

**( سيسێ )**
ناڤێ ژنایە • ژ سیس هاتیە • خوەشکک وپۆر سپيو زەر ، جوان و شەنگە • وهارەنگە (سیس) ناڤکە • (سیسک) بچوکێ وێ یە •
ع ـ اسم امرأة •

**( سيتێ )**
گوندەکە • ل ناڤ ئومەریا دکەڤي • دەلکي نە • گلک ژ لاڤردی و حەنەکا رە دل خوازن • چیرۆک وسەرێهاتیێ وان گلک

هەنە • ع - (قرية) •

## (سي - ئي)

( آورەك )

ئەڤ (ئي) ژ بۆ بالقەدانێ هاتیە وەك :- جزیری - كۆیي - سۆري - موسلي - آمەدي - هەڤیركي - دەكشوري - مەحمودكي - عەتمانكی •••

ع - (یاء النسبة) •

## (سي - ئۆ)

( آورەك )

ئەڤ (ئۆ) دناڤ دە ژ بۆ بچوكي و سڤكی هاتیە • هنك ژ ناڤ تێ آڤێتن و (ئۆ) دكەڤي داویا وی وەك :- (علی) دبي (عەلۆ) (حەمید) دبي حەمۆ - (رەمەزان) دبي رەمۆ - (خەلیل) دبي خەلۆ •••• جارنا ژ كۆكا گۆتنێ یە • وەك :- (حۆرۆ) ناڤێ هەسپەكي یە • سوارێ حۆرۆ ••• ( زۆ زۆ ) - جۆت جۆت •••

ع - (اداة للتصغیر والتخفیف)

( سینگۆ )

یا (سنگۆ) • ئەو هاسنێ تۆژە كۆ بسەرێ نڤگا ڤە دكن • و بێ شەرێ سینگا سینگا دكن •

ع - (الغدارة) •

( سیرۆ )

چیرۆكا سیرۆ و پیڤازۆ ل وەلاتێ مە ناڤدارە • ژ زارۆكا رە تێ گۆتن • پیڤازۆ ژ نەزاني تێ كوشتن و سیرۆ ژ مزاوري تۆلا وي دستێني •

ع - (قصة فكاهیة) •

( سینۆ )

ناڤێ مرۆڤەكي ناڤدارە • مالا ( سین و سەیدۆش ) دوەلاتێ مە دە ناڤدارن ئۆجاغن كورد ب وان سوند دخون : ب ئۆجاغا سین وسەیدۆش •

ع - ( عائلة مشهورة ) •

:ـ وهارەنگە ( مالاســـــينۆ ) ئێلەكە كوردە • ژ پەنجي‌نارا يە • ع ـ ( عشيرة ) •

( سيس )

گەور و بۆز وسپي وزەرە • دەرباس بويە •

( سيغ )

كەلەمەكي • سەرتوژ وزراڤە • ژدار و هاســـــن چێ دبن • ژ ( خيپ ) درێژترە • گلك جارا گۆرا ، تەنتەنا ، كەنزا ب وان چێ دكن •

ع ـ ( الأسياخ ) •

( سيخ )

هنك ژ خەلكێ هنـــدێنە • هن دبێژن :ـ ( ســـيك ) • دهەمبەر مسلمان دە هاتيــە • وا ديارە بداخوازا نەبـــاڤژ هاتيە •

ع ـ ( بعض من الهنود ) •

( سير )

ناڤدارە • ع ـ ( الثوم ) •

( سي‌بەر )

سي‌يە • يان جهێ كۆ ســـي ل بەرە • وەكـــە :ـ كۆل ، ديوار ، دار ••• سيا ڤا تشت سي‌بەرە • ژبەر كۆ ل بـــەر رودنن ـ دادنيشن •

ع ـ ( الفيء ) •

( سي‌سيك )

ع ـ ( السفارة )

( سيرك )

جۆقەكە ليزتكێ يـــە • تێدە سڤكي و پەهلەواني وهين‌كرنا تەبا هەيە • بەرێ مە ژێ رە دگۆت :ـ پێلەوان •

ع ـ ( السيرك ) •

( سي‌سك )

ناڤكە • ع ـ ( نواة ) •

( سيل )

يا ( سيلەبەند ) چەند ڤايشن ، يا چەند بـــەن ـ بەنـــدێ بگولك وريشي نە ددن بـــەر سينگا هەسپا • ( بەند ) ديارە

لێ ( سيل ) نزانــم ژ كــو هــاتيه •

( سيئۆل )

باژاره‌كي كوريا ژێري يه • دشه‌رێ سيئۆل ده گلك كورد هاتن كوشتن • (جلال بايار) خورتێ كـــورد وتـرك بدۆلارا قرۆتن ( ترومان ) و دانه كوشتن • د ديوانا من ده ئه‌ڤ داباش هه‌يه •

ع ـ ( مدينة كورية ) •

( سي‌سالك )

ته‌يره‌كه سه‌رێ وى كه‌چه‌له•

ع ـ ( النسر ) •

## (سي ـ م)

( سيم )

سورمه يه• سپي وزدر هه‌يه• ده‌رباس بويه پێ شال وشـاپ وقتكێ چوخ و عه‌با نـــه‌خش دكن دخه‌ملێنن زۆر جــوان ده‌ردكه‌ڤي •

ع ـ ( قصب ) •

( سينه‌م )

ناڤێ كه‌چه‌كێ‌يه • سه‌رپێهاتي يا ( ميرمحێ و ســـينه‌م ) ه • چيرۆكا وا دور ودرێـــژه • دبێژن :ـ پشتي كۆ سينه‌م مر محێ ل بەر گه‌ياكي جـــوان رودنشت وستران دگۆتن ، پەلێ گه‌يێ دوه‌شـيان • ناڤێ وى گه‌يايي بويه ( ســـينه‌م ) هه‌ر چه‌ندان بــاوه‌ر ناكم لێ آورا خوه‌دێ چيرۆكێ گلك توژ و دوربێن و فره‌هه •

ع ـ ( اسم عشيقة مشهورة )•

## (سي ـ ن)

( سيپان )

چياكي بلنـــد و ناڤ‌دارە • درۆژ آڤايێ گۆلا وانێ ده يه• سيپانێ‌خـــه‌لاتێ دبێژن :ـ سه‌رێ وي هه‌ردەم بەرف لێ دبــاري • جهێ چـــيرۆكا ( سيامه‌د وخـــه‌جێ ) يه • دبێژن :ـ سيامه‌د وخه‌ج دڤي چيايي ده داويــا شــــادي وخوه‌شي برەشي گوهه‌رتنه ، پشتا وان دكه‌لـــه‌مێ مرنێ ده ودلێ وا ئێ ئه‌ڤينـــــدار بێ

ئەفگەر مانە • هێڤیا وان ل ڤر داوی هاتیە • چیرۆکا سیامەد ئەتەنێ سەرپێهاتیەکە ئەڤینداری یە لێ فەلسەفاکە قەدەری یە •

ع ـ ( جبل مشهور ) •

( سیسەبان )

نافێ سەرپێهاتي یەکە هونایی دبوارا ( محمد ) دە هاتیە چێکرن • شەرێ سیسەبانێ یە • هۆزان بخوە دبێژی :ـ ( نەوالا سیسەبانی ) لێ ئەڤ سەرپێهاتي دتاریخا دە نایێ بیرا من •

ع ـ ( معرکة وادي سیسبان )

( سیسەبان )

گەیاکە • دزڤستانا دە شین دمێني • ل بەغدا من دي یە • دبي ل وەلاتێ مە ژ بەر سەرما نەمێني •

ع ـ ( شجرة ) •

( سینان )

گوندەکە • ل رۆژ آفایێ چەمێ بشێری یێ دکەڤي •

گوندەکي آفا ودەولەمەندە • سالەك ل سینانێ مامە •

ع ـ ( قریة ) •

( سیلان )

وەلاتێ ( سیلان ) دژێری رۆژهەلاتێ دور دەیە • هەمسینۆرێ هندێ یە •

( سین )

نافێ تیپەکێ یە •

( سیە )

بداخوازا ( سي ) (٣٠) هاتیە •

## (سێ ـ آ)

( سێپا )

سێپي ـ سێپێ • سەه پایە • سێ دارن ژۆرێ وان بهەڤە گرێدای مرۆڤا پێڤە بدارڤە دکن • ژن مەشکا خوە پێڤە بدارڤە دکن •

ع ـ ( المشنقة ) •

( سێتا )

بداخوازا سێڤاتە • جارنا بداخوازا سێ بەنە ـ سێ

نەخە • ئەزێ حەقێ خـــوە
سێتا ژتە بستێنم ـ سێقاتە •
وەریسێ من ســێتا يـــــە ـ
سێبەنە •

( سێزدە )

(٣) زێدە (١٠) • ژ ( يازدە )
تا ( نۆزدە ) ژمارا زێدەيە ـ
زێدەژمارە • ناڤەكي پەرچيمە
• ژبەركۆ تيسپا پێوەند هاتيــە
راكرن •

ع ـ ( ثلاثة عشر ) •

( سێمە )

ليزەكە زارۆكايە • دبێژن :ـ
سيمە ، چارمە •••

ع ـ ( لعبة للاطفال ) •

( سێ )

رەقەم (٣) يە • ناڤێ رەقــەم
(٣) يە ، يا ناڤێ داخـــــوازا
رەقەم (٣) يە • كورمــــانج
جارنـا دبێژن :ـ ( سسێ )
بداخوازا (٩) يانى سێ جـارا
سێ • لێ چما ولۆ گۆتنــە ؟

هەر وەكو تێ بەر گۆمانـــــا
من • دەما بێژن:ـ (سێچون)
ئەم نزانن آيـــا ســێ مرۆڤ
چون ، يا ســـــێ جارا چوين
بويە • هەروها ( هاتن ) ژي
ولۆ يە :ـ ( سێ هاتن ) آيــا
سێ مرۆڤ هاتن ؟ يا هـــاتن
بخـــوە سێ جــــــارە ؟
:ـ هــەروەكو ( دۆ ـ ددۆ )
ژي ولۆيە :ـ ( دۆ هاتن ) ـ
( دۆ چـــون ) آيا دو مرۆڤ
چون ؟ يا دۆهـ چـــــون ؟ ژ
بۆكۆ ئەڤ دخان زســـــــەر
داخوازێ رابي ئەڤ چـەوتي
راست بن ( ددۆ ـ سسێ )
هاتنە گۆتن •

ع ـ ( الثلاثة ) •

( سێبەرێ )

ناڤێ ژنەكێ يە • چيرۆكـــــا
سێبەرێ وخەسوێ ناڤدارە •

( سێسێ )

ژمارەكـــە ـ پـەســـنيـيە •
دبێژن :ـ سێسێ ، چارچار •

یـەكێیـەك دۆدۆ زۆزۆ ،
فەرفەر. سێسێ وەرن. یاني
هەرسێ مرۆڤ بهـەڤرە
وەرن . دۆدۆ ، چارچار ،
یەكێیەك . ژي ولۆنە .
ع ـ ( عدد تقسیمي ـ ثلاثة
ثلاثة ) .

**( سێڤێ )**
ناڤێ ژنەكێ یە . سترانەكێـ
پەستاكێ ل سەر هاتیە
چێكرن .
ع ـ ( اسم امرأة واسم
اغنیة كوردیة ) .

## (سێ ـ ئي)

**( سێپي )**
دەرباس بویە . سەهپایە ـ
سێدارە یە .

**( سێدەلي )**
ناڤێ قبەكێ یە . ل بازارێ
( فارقینێ ) دناڤ گۆرنستانا
( مەروانی ) یا دە یە . لێ
وا دیارە كۆ ( سێدەري )یە.
یان ( سێتلي ) یە .
( سەیدەلي ) ژي دبي ژ
( سێدەري ) بێ ، یـا
( سێتلي ) بي .
ع ـ ( بنایة قدیمة أثریة
بفارقین ) .

**( سێني )**
ناڤێ پیانەكێیە . ژ مەرسەفي
مەزن ترە . خوارنێ تێ دە یا
ل سەر دخون .

**( سێوي )**
بێ بڤ ، یا بێ دێ وجاڤە .
( سێوێ ترەك ) بێباڤە .
( سێویێ بنچەنگ شەوتي )
بێدێ یە . سێویێ ل روێ
خوە رابوي بێ دێ و باڤە .
ع ـ ( الیتیم ) .

**( سێرت )**
بازارەكي كوردستانا بندەستێ
تركا یە . نێزیكی شارێ
( بەدلیس ) ە . ( مەلاخلیلێ
سێرتي ) هۆزان و پێزانەكی
مەزن وناڤدارە . گلك
نقشتێ گرانبها دزمانێ عربي
دە چێكرنە . من بخوە
( استعارا ملا خلیل ) خوندیە.

لێ تشتێ گلک گران بهـــا نقشـــتا کـــۆ بکوردی ـ کورمانجی چێ کریـه • ناڤێ وێ ( نهج الانــــام ) ه • هونایێ برست دانیه • هاتیـه چاپکرن •

ع ـ ( مدینة کوردیة ) •

**( سێواس )**

بازارەکي ترکیه • دسینۆرێ کوردستانێ دەیه • رۆژهلاتێ وێ کورد و رۆژآڤـــایێ وێ ترکن •

ع ـ ( مدینة ترکیـة في غربي کوردستان ) •

**( سێنج )**

دیوارێ آڤیا یـــه • لێ پرێ جـــارا ژ دارا تێ چێ کرن • دارێ ســنجی دســــینجا ده دچێنن •

ع ـ ( سور من الاشجار حول البساتین ) •

**( سێسەد )**

گونــــدەکـــه • ل زێرێ رۆژآڤایێ ڤامشلۆ دکەڤي •

ع ـ ( قریة ) •

**( سێسەد )**

کارتەک ژمارە • ناڤ دارە •

ع ـ ( ثلاث مأة ) •

**( سێبەر )**

دجاو ده خویادکي • سێ ڤاتەـ ســـێ رویه • ( ســـێ بار ) سێ جارە •

**( سێسەر )**

سێ ڤاتە • بارام ترییێ خــوە سێ ســەر ب گـــەنم ددی ـ سێ ڤات ب گەنم ددی •

**( سێ دەر )**

هەیوانەکە • دیوارێ وێ ئێ پێشي ل سەر ســــتونا یه • دکۆکا خوە دە سێ دەرێ وێ هەنە • سێ دەرگە یە •

ع ـ ( صالون ـ او بالکون )

**( سێ دەر )**

نـــاڤێ شکەڤتـــەکێ یە ل رۆژهــــلاتێ بــــازارێ یا کەڤــــــەبازارێ ( دارێ ) دکەڤي • ددیـــوانا مـــن ده هاتیە :ـ وەک شــــکەڤتا سێ دەر ه •

ع ـ ( اسم کهف ) •

**( سێچار )**
دبێژن :ـ بارام سێچار جـارا دەته مەلا مه • یا سێ یا چار• ژگۆمان واڵۆ هاتیـه گۆتن • ژبەرکۆ نزاني نەسێجارا هاتیه نەچارجارا هاتیه •

**( سێڤ )**
ناڤداره ـ سیوه •
ع ـ ( التفاح ) •

**( سێلێڤ )**
ئەو مرۆڤێ کۆ گۆشتێ لێڤـا وي ژهنـدرو ده پردبي دەماکۆ دپەیڤي لێڤا وی دوتـا دبـێ • ژوی مـرۆڤي ره دبێژن :ـ سێلێڤ •

**( سێگاڤ )**
ناڤێ لیزەکي یه •
ع ـ ( لعبة القفز ) •

**( سێناڤ )**
جارنـا دبێژن :ـ وي مرۆڤێ کۆ گلک جـارا نـاڤێ خوه دگوهەري •

**( سێرۆژک )**
رۆژيیەکه • سـێ رۆژا ل پەی هەڤ دکرن •
ع ـ ( صوم ثلاثة ایام ) •

**( سێرۆژک )**
خوارنا مریا یه • پشـتێ سـێ رۆژێ مری دقـەدن خوارنەکێ لێ ددن• ناڤێ وێ خوارنێ ( سـێرۆکه ) • دنفـراده دبێژن :ـ ئـەز سێرۆکا ته بخـوم ! یانی خوەدێ بکی تو بمري •
ع ـ ( طعام بعـد دفن الموتى بثلاثة أيام ) •

**( سێڤۆک )**
بەرێ گەیاکي یه • وەکـه سێڤێ شین وهورن • زارۆک ژچۆلێ دچنن ودخـون • گەیایێ سێڤۆکێ ژبو چاندني یا دەخل نەباشه •

**( سێلاک )**
یا ( سێله ) قوما بەر چەما یه•
ع ـ ( الرمـل ) •

**( سێل )**
ناڤداره • ل سەر نان شکەڤا چێدکن• رەشه ، بتەني یه•

ع ـ ( الساج ) •

( سێپەل )
ئەو دار و گەیایێ کۆ نــو دەردکەڤي •

( سێوەرتال )
ئەو خۆرتێ کۆ ناکەڤيبەرچاڤێ مرۆڤ • ژبۆ کێماسي ژێـره دبێژن :ــ سێوەرتـال • یاني زارۆك ، یا سێویێ پیسك ـ آواره •

ع ـ ( للاهانة ) •

( سێشەم )
کورد و فارس ب شـــەڤا دژمێرن • لێ عرب ب رۆژا دژمێــرن • ســێشــەم ـ سێشەڤ ـ سێشەوە •

ع ـ ( الثلاثاء ) •

( سێروان )
ناڤێ ئۆتێلەکێ ل بەغدایـە • ناڤێ جهکی خوەشە • ل هێلا ( سلیمانيیێ ) دکەڤي •

( سێهەم )
یا سيیەم • سیەمین •

ع ـ ( الثالث ) •

## (سۆ ـ آ)

( سۆبا )
مەلەڤانە • ئێ ب چەنگێ خوە دآڤا دەرباس دبي • ئێ کـۆ ( ســـــۆبایی ) دزانی ـ ئێ مەلەڤاني دزانــی • ب بازوێ خۆ لە آو ئەپەری •

ع ـ (سیاح) •

( سۆدا )
دونفش تۆزن • یەك دخـن ناڤ آڤێ وڤەدخون • ویەك دخن ناڤ آڤێ وکنجا پــێ دشون • لێ نزانم ژکو هاتیە • عربیژی ولودبێژن •

ع ـ (صودا) •

( سۆرا )
ناڤێ دەرەبەگي یەکێیە • ل هاویر شارێ (هەولێر)دکەڤي• دتاریخا شەرەفخان دە دور و درێژ هاتیە گۆتن • لێ ایرۆ دهەمبەر کورمانج و لـۆر دە جي کرتیـــە • شەرفخان دبێژي : شیوەیێ کوردي چار پەرچەنە :ــ لۆری ، گۆری ـ

کەلهۆری ـ کورمانجي • لێ ایرۆ ئەم کارن بێژن :ـ ۆری ـ گۆری ـ سۆری ـ کورمانجي •

ع ـ (عشائر کوردیة في شمال العراق بکوردستان العراق) •

( سۆرکا )

ایلەکە مەزنە دکەفي ژێرێ رۆژهلاتێ باژارێ دیرکا چیایێ مازی • میرێ سۆرکا ل وێ هێلێ ناڤدارن • وهارەنگە گوندەکە • دکەفێ رۆژهلاتێ شارێ آمودێ ـ عامودێ • ع ـ ( عشیرة ) •

( سۆعانا )

ایلەکە کوردە • ایزیدییە • ل ژێرێ (آمودێ) دکەفي •

ع ـ (عشیرة) •

( سۆغانا )

گوندەکە • ل ژێرێ (آمودێ) دکەفي •

( سۆفیا )

و (سافیا) دو گوندن • ل رۆژهلاتێ شارێ آمەد ـ دیاربەکر ) دکەڤن • سترانا خێریا حەجی وباقێ بەهجت • ژگوندێ سافیا دەرکتیە •

ع ـ (قریة) •

( سۆفیا )

پایتەختا بلغارە • بلغارستان وەلاتێ بلغارە • دبالقان دە هەم خاکێ ترکێو یەونانو رۆمانیا و یۆغسلاڤە • وەرگرتن وبەرگێ وان وەکە ئێ کوردانە •

ع ـ (عاصمة بلغاریا) •

## (سۆ ـ ئه)

( سۆبه )

گلک نفشێ وێ هەنە • آگردانەکە • بدار و گاز و کارەبا آگرێ وێ دبي • ناڤدارە • گلک بەرەپێش چویە • ع ـ (صوبیا) • (سۆبه) ـ بسەرێ خوە • بارام سۆبە هاتیە ـ تەنێ هاتیە •

( سۆرۆ )

نافێ گەرناسەكي چيرۆكـــا (رەشوێ داري) يە • چيرۆكا كۆ تێدە رەوشا جفاكي يـــا ملەتێ كورد بشيوەيەكـــي گۆوندی هاتيە بەلاڤكرن •

ع - ( بطل قصة ) •

( سۆمۆ )

مالا سۆمۆ • ل ناڤ (ميرسينا) هەبون •

( سۆغي )

بداخوازا داوي هاتي يـــە • دبێژن :ـ شەر دەست پێكـر سۆغي ئەم چەبكن ؟

( سۆفي )

(صوفي) ژعربي هاتيە • لـــێ كورد گلك صوفي هەنە • ئێ دەستێ خـــوە ژجهـــانێ بەردديي • لێ دايرۆ دە سوفي بەندەكە ئولپەرەستي شيـــخ پێ دنيايێ دخون •

( سۆهتي )

ئێ شەوتي يە :ـ سۆتي يـــێ تيرێ دو چاڤێ تە رزاخـــان

وكەمال • ع - (المحروق) •

( سۆڤاج )

ل شونا سۆبا دآڤانيێ مەزن دە ل جهێ سار داتينن • ئولێ هاسني آڤا گەرم دوانڤـــە ل ئۆدا دگەري •

ع - (السۆڤاج) •

( سۆر )

رەنگەكي ناڤدارە • سۆرايي - سۆراهي •ژێدەرێ سۆرە• هن دبێژن :ـ ســــۆريتي • سۆركرن تێپەرە •

ع - ( الاحمر ) •

( سۆبەبەر )

سۆبايە • ئـــەو مرۆڤـــێ ب آڤەژەني دزاني • بمەلەڤانـــي دزاني •

ع - (السباح) •

( سۆز )

قەرار وعدە - بەختە • سۆز وقرار ل پەيي هەڤ تێـــن • بسۆزوقرار • بارام بــــێ سۆزە - بێقرارە • ل ســـەر

گۆتنا خوه نامێنی •
ع ـ (الوعد) •

( سۆرداش )
چیاكی ناڤداره • لهێلا
شارێ (سلیمانی) دكهڤێ •

( سۆرنگ )
آخه • یا دەرمانەكی سۆره •
پەز پێ نیشان دكن •

( سۆرك )
نەخوەشی‌یەكە زارۆكا یه
ناڤداره • ع ـ (الحصبة) •

( سۆل )
پیلاڤه • سۆلبەند ئێ كو
سۆلا چێدكی • دبەستاكێ
ده هاتیه گۆتن :ـ سۆلبەندوا!
سۆلا چێكه ـ نالبەندۆ !
نالا چێكه •
ع ـ (الحذاء) •

( سۆمال )
وەلاتەكی ئەفریقی‌یه •
پەرچەپەرچه بویه • لێ ایرۆ
پەر بآزادی دچی •

( سۆتن )
شەوتاندنه • ته ئەز سۆتم
ـ سۆهتم ـ شەوتاندم •

ع ـ (الاحتراق) •

( سۆژان )
وەكه سۆهتن هاتیه • وا
دیارەكۆ تێنەپەره • دآگرده
دسۆژم • ع ـ (الحرق) •

( سۆسن )
گولەكه ـ كولیلكەكه •
ناڤداره • پاشێ بویه ناڤێ
ژنا ( سۆسنێ ) •
ع ـ (زهرة) •

## (سو ـ ئه)

( سوخته )
شاگرته • ع ـ (طالب) •

( سوریه )
وەلاتێ سوریه • دكەڤی
راژێرێ كوردستانا بندەستێ
تركا • دژۆرێ وێ ده بگر
نیڤ ملیۆن كورد هەنه • لێ
كوردستانا سوریه ژ چەمێ
دجله تا دەریا سپی بكوردستانا
بندەستێ تركا ڤه گرێدای
یه • ایل ومالبات وباڤكێ
كورد پەرچه بونه هن ل
ژۆرێ سینۆر و هن ل ژێرن

:ـ باڤ ل زۆر وكـــور ل ژيره • ژڤان پێڤه نێزيكـــي (٥٠) يا (٦٠) هــــزار كەس ل شام و حلــب و حمــا و (تل كەلەخ) و حصن الاكـــراد و چيايێ علوي يا پەيدا دبن• گلـــك مرۆڤـــێ ناڤدار ژكوردێ سوريه رابونـه :ـ مالازركلي ، مالابەرمەده ، مالا هنانـۆ ، مالابـــەرازى ، مالا عبدالرحمـــن پاشـا ، مـــالا شەمدين آغا ، مالا بەگداش ، مالا بۆزۆ ••• دور و دريـژ دتاريخـا ( اديب معوض ) ده كۆ بناڤێ (الاكراد في سوريـه ولبنان) هاتيه چاپكرن ئـەڤ داباش هاتيه كرن •

**( سوس )**

ناڤـێ گــەياكى يه • تـــال وشيرينه • آڤا وي دفرۆشن • ل كوردستانێ گەياك هەيـه ناڤێ وى سوسه • هــــن دبێـــژن :ـ شـــرتك لـــێ باوەردكم نەئەڤ سوسه •

**( سوج )**

گونەه • نەسوجێ منـــه ـ نەگونهێ منه • سوجێ بـارام گونەهێ بارامه • ســـــوج وگونەهە گلك جارا ل پـەي هــــەڤ تێن :ـ بێســــوج وگونەهە وەر مه ددى بـــەر سەتەمێ •

ع ـ ( الذنب ) •

**( سوند )**

ناڤداره • ع ـ ( القسم ) •

**( سوسك )**

ناڤێ چڤيـــــكەكێيه • وەك كەڤۆكێيه • بشـاقولا ئـەم نێچيرا وا دكن •

**( سودم )**

سيردم • وەكه سيرێ يـــه • ل چۆلێ شـــين دبي • تێ خوارن •

**( سوستەم )**

ناڤێ نفشـــــەك تڤنگێ كەڤارەيه • سوستم بداخوازا مۆديل • ژتوركي هاتيـــــه كوردي •

( سودان )
وەلاتەکە • پەرچە بویــە • ل افریقــا یـــە • ایــرۆ جەمهوریتا سودان برومەتە • ( خەرتوم ) پایتــەختــا سودانە •
ع ـ ( معروف ) •

( سولان )
گۆنــدەکــە • ل هێــلا کەڤنەبازارێ ( هەسکیفێ )یە•

( سوریان )
ناڤێ ملەتەکی کەڤنــارەیە • بەرێ جهێ وان دناڤبــەرا سوریە و عــراق دە بو • لێ ایرۆ بەلاڤ بونە • پایتەختــا وا یا ئولپەرەســتي ل بازارێ ( حمص ) ە • ل وەلاتێ مە ژی سوریان پەیــدا دبن • ژوان رە دبێـــــژن :ـ ( یعاقبــة الاکراد ) یاقوبیێ کورد • لێ زمــــانێ وان سوریانی یە •

( جا ـ آ )

( جا )
آلاڤەکە • ژبۆ خوەشــکرنا پەیڤی دێیشدە هاتیە • شونـ ( سا ) گرتیە :ـ جابخوەدێ ئەزناکم • جابســەرێ بافێ تەکم ئەزڤەناگەرم •
ع ـ ( أداة للتمهید ) •

( جاکارتا )
پایتەختا وەلاتێ (ئەندۆنوسیا) یە • دهندوئۆکیانۆس دەیە • دناڤبەرا ئەندۆنۆســیا و هۆلەندا دە لســــەر ایریانارۆژآڤا سەرگێژي هەیە•
ع ـ ( عاصمة اندونیسیا ) •

( جامایکا )
پەرچاک ژئەفریقــا یــە • بندەستێ کۆلەدارێ انگلیزە•
ع ـ ( جزیرة افریقیة ) •

( جاوا )
گەزیراکە • ژ ( هندونوسا ) یە • ع ( جزیرة اندونوسیة )

( جازیا )
ناڤێ ژنەکێیــە • ژجازو ـ جادوا هاتیە • بداخوازا •
ع ـ ( ساحرة ) •

## ( جا ـ ئۆ )

**( جاردۆ )**

کاردۆ ـ گاردۆ • ناڤـەکي کورد ئێ‌تاریخیـیە • وەک:ـ گۆتۆ ـ جۆتۆ • هن دبێژن:ـ کاردو ـ قاردۆ •

**( جارۆ )**

ناڤێ مرۆڤەکیـیە • مالا جارۆ لکوندێ هەساری جیرانێ مەبون • ژیک‌جار هاتیـە یانی کو جارەک تشـتک گۆت هەو ژێ ڤەدگـەری • یان جارەکە تەنێ دَبی •

**( جازۆ )**

ناڤێ ژنایە • ژ ( جـادو ) هاتیە • بداخوازا ( سەحارە)•
ع ـ ( الساحرة ) •

**( جاڤۆ )**

بـاڤێ وی مـرۆڤێ کـۆ ( حەسنێ موسی ) کوشـتیە • ( حەسنێ جاڤۆ ) • دسـترانا ( حەسنێ موسی ) دە هاتیە •
ع ـ ( اسم رجل ) •

**( جانۆ )**

باڤێ شـاعرێ ناڤـدار ( قدری‌جانە ) • نـاڤێ وی عبدالقادر کورێ جـانۆ یە • لێ پاشێ بویە قادرێ جانۆ ـ قـەردی‌جان • ژ بـاژارێ ( دێرکا ) چیایێ مازیـیـە • ایرۆ لباژارێ شامێ‌یە •
ع ـ ( اسم او کنیة شاعر ) •

## ( جا ـ ئێ )

**( جازێ )**

ناڤێ ژنەکێـیە • مالاعلی‌خانێ جازێ • مالاسـمکۆپاشانە • دکوردسـتانێ‌دە ناڤ‌دارن • سەرداری ایلا ( شکاکا ) نە• ژوارە دبێژن : عڤـدۆیا • لکوردستانا بن‌دەستێ ایران دکەڤن •
ع ـ ( اسم امرأة ) •

**( جانێ )**

ناڤێ بەستاکە ناڤدارە • دڤاوانا دە هاتیە گۆتن • کـوردێ وەلاتێ مە لبەر گۆڤـەنـد

وديلانێ دكن •
ع ـ ( اسم اغنية كوردية ) •

## ( جا ـ ئي )

**( جامي )**

پێزان وهۆزانەكي مەزن وناڤدارە • ژكوردێ ايرانێ يە • دبێژنێ :ـ مەولانا جامي • وهارەنك ناڤێ نقشتەكە وی هەيە بڤی ناڤي دخوندنا كەڤارەدە گلك برومەتە :ـ ( كەس ناكتە مێتەرێ خوە جامي ـ راناگرتن كەسەك نظامي ) • خ •••

## ( جا ـ ئو )

**( جادو )**

ياجازو • بداخوازا ( ساحرة ) هاتيە • جادوە سحار •
ع ـ ( الساحرة ) •

**( جازو )**

وەكە ( جادو ) هاتيە •

**( جانت )**

دولابێ لنگێ مەكينايە • كۆ كاوچوكا تێدە بچي دكن • ئەوروپي يە • لێ بەلاف بويە •

**( جاموس )**

گاموشە ـ گامێشە • ( موش ) باژارەكي كوردستانێ يە • ( مێشە ) دەحلە • داروبەر وآڤە • ( مێش ) و (كەلمێش) پێشي ـ پێشو يە • داخواز ژ ( گامێش ) ـ جاموس ـ گاموشە ••• يا گايێ موشێ يە • يا گايێ مێشە يە • يا گايێ كۆ ژبەر مێشا دەرڤي ودكەڤێ ناڤ مێشە وآڤێ • لجەم من يا پاشي راستە • ژبەركۆ هاتيەگۆتن :ـ ( أكل ثور نحمل بيض الشجرة ) • ( ثور نحل ) بداخوازا ( گامێش ) هاتيە • ( بيض الشجرة ) سپي دارە •

## ( جا ـ ر )

**( جار )**

جارەك ـ دوجار ـ جاريك ـ دوجارە • ( نەقلە )

ڤێجارێ ـ ڤێنەقلێ • ایمجار ـ ئەم جارە ـ ئەڤجـــار ـ ڤێجار •

ع ـ ( مرة ) •

**( جامێر )**

جوانمێر ـ جوانمـــەردە • مێرێجوان ـ مێرێ جومەردە • وا دیارە مرۆڤێ جـــوان مەردە ـ دەستبەلاڤـــە ـ دەستڤەکرییە • ( جـوان ) بداخوازا خۆرتە ـ گەنجە • هێنو گهایە دەما خـــوە ـ جـــامێر ـ جۆمـــەرد ـ جوانمەردە • مەردێجوان • یاجوانێ مەردە • بسـۆراني ( جوان ) بداخـــوازا باش ـ خوەشك • رند هاتیـــــە • وێچاخێ جوامێـــر ـ مێرێ باش ـ مێـــرێ چێ ـ مێرێ رندە •

ع ـ ( الرجل السخي والطيب )•

**( جاندار )**

خوەدي جانە •

ع ـ ( ذی روح ) •

**( جانەوەر )**

جانداری مرۆڤخوەرە • هن دبێژن :ـ ( جەناور ) •

ع ـ ( الحیوانات الضارة ) •

**( جانگیر )**

جهانگیرە • ئێ کۆ جهـــانێ دگري ـ داگیردکي •

ع ـ ( حاکم الدنیا او ســلطان العالم ) •

**( جاوبر )**

مەقەسە • آکۆ پێ جاو دیرن•

ع ـ ( المقص ) •

**( جاوکر )**

ئێ جاو دکري •

ع ـ (مشتری الخام) •

**( جانباز )**

جانسڤکە یا وەک باز ســڤکە وپاشێ بویـــــە نـاڤێ مرۆڤێ خاپینۆک • ع ـ (الحیال) •

**( جاف )**

ناڤێ ایلەکە کوردە ناڤدارە •

لكوردستانا عراق وايـــران پەرچە بويە • جـاف وبلياس لپەي هەڤ تێن •
ع ـ (عشيرة كوردية كبيرة) •

**( جاجق )**
لدەشتا ( ديار بەكر ـ آمەد ) ژفردك رە دبێژن :ـ جاجق• نان دفردێنن ناڤ دەو •

**( جارەك )**
يەكجارە ـ جاريكە • (جار) دەرباس بويە • بداخـــوازا نەقلە • ع ـ (مرة) •

**( جانوك )**
جوانيك ـ جوانى ـ جەعني• بچوكێ مەهينايە • دەمـــا دزێ ناڤـــێ چێليـــكا وێ جانوكە • لێ ئـەم دبێژن :ـ جوانى • بچوكێ وێ جوانيكە
ع ـ (المهرة) •

**( جامجامك )**
ئێ كۆ بتەنێ گۆڤەنـــــد ودیلانێ دكي دخن تليـــێ خوە ولهـــەڤ دخــي ، جەقجەق ژوان تێ •

**( جام )**
ناڤدارە • بشەوق وشەمانە• مرۆڤ خوە تێرە دبێني • هن دبێژن :ـ تەنيك • وهـــن دبێژن :ـ مرێك • وهـــن دبێژن :ـ آينە ـ عەينە •
ع ـ (المرآة) •

**( جان )**
تێن وخـــــورتێيا لاشـــێ جانداره • هن دبێژن :ـ جان ژلاش جدايە • وهن دبێژن:ـ جان ژلاشە • وەكە رۆناهيێ لۆكسێ چاوا بآليكاريـــــا لەباتێ وێ پێكتێ •بێ گۆمانە كۆ رۆناهي ب( مادە ) ڤـــە گرێداي هاتيە آفراندن •
ع ـ (الروح) •

**( جاوان )**
يا (گاوان) ائێلەكە كـــــوردە مەزن وناڤدارە • دەرەبەگى يەكە مەزن لعراڤـــێ لدار خستنە • ( مير ضياء الديـــن مهلهل ابو الصاكر الجاوانى) زڤێ ائێلێيە • (ابن خەلەكان)

دتاريخا خوەدە دبێژي وداباشا
وی دكي • بەرگـــێ دوەم
٢ رويەل (١٠٦) •
ع ـ (عشيرة كوردية في جنوب
العراق) •

( جاه )

خودی جاه • جهـــێ وی
لجەم هەركەسي هەيە • لـێ
عربا ژی ولۆ گۆتيـە • تەنێ
باوەرم ژكوردی وفارســـي
ستاندنە • ع ـ (جاه) •

( جاو )

خامە ـ خافە • يانافێ خامەكی
يە كۆ ژ پەمبو چێدكــن •
لناف كورمانجا دەما يەكـێ
دەرەوا بكی ژێرە دبێژن :ـ
بچرێ جاو جاوێ تە يە •
ع ـ (الخام) •

## ( جه ـ آ )

( جەلەولا )

باژارەكی كوردە نافدارە •
كەڤنارەيە • دكـەڤي زۆرێ
خانەقين • لەشـــكرێ عمر
دابريشێ خوەدە دگەل خەلكێ
(جەلەولا) پەيمانەك بەستنە•
ع ـ (جلولا) •

( جەلولا )

نافێ نقشتەكە ئۆلا ايزيدی يە•
لێ نزانم ل كۆ هەيـــە ؟ دبي
نقشتا شيخ هادي بي ـ عـــدی
كورێ مســـافر • ژخەلـكێ
هەكاری يە •
ع ـ (كتاب مقدس كوردی) •

( جەما )

جەژنەكە پيرۆژ ونـافدارە •
جەژنا كوردێ ايزيـــدی يە •
سەيدايێ خانی دبێـــژی :ـ
دێ هەردو لئەردەكي جەمـا
بن • یاني بجڤن ـ كۆبن•
ع ـ (التلاقي او الاجتماع) •

( جەمالا )

نافێ بەرەكە كوردە • ژايـلا
(ملا) یا ژايلا (كيكا) نـــە •
شەرێ بۆزبەگێ جــەمالي •
لناف كـــوردێ جزيـــرێ
نافدار وبەدەنگە •
ع ـ (عشيرة كوردية) •

( جەزالا )

بەرەکە • ژائێلا (تەیا) یـە • گلـەک ژوان بکـوردی داخفن ـ دپەیڤن ـ قسەدکن• ئەڤەر ژ(جۆل) هاتبـــي کوردن• لێ ئەڤەر ژ(جولان) هاتبي عربن •

ع ـ (عشيرة عربية) •

## ( جه ـ ئێ )

( جەوزێ )

گوندەکە • ل‌ناڤ ائێلا بریفـا لهێلا بازارێ (ستەورێ) یە• (ابن جوزی) دبي ژفـــي گوندی بـــي • زانایـــێ خوەندەوار ژگوندێ جەوزی گلەک رابونە •

ع ـ (قرية) •

## ( جه ـ ئي )

( جەلالي )

ناڤێ ائێلەکە مەزن وناڤ دارە• دکەڤي‌راژۆرێ کوردستانـــا ایران وهـن دکـــەڤن ناڤ کوردستانا بن‌دەستێ ترکـا • ائێلا جەلاني‌یا بتالانکـــرن وریێ‌برین ناڤ‌دارن • ئەڤـەو ئەڤ بویە ناڤێ هەمو کەســێ ریێ‌بر وتالانکەر ومێرکوژ •

ع ـ (عشيرة كوردية مشهورة)

( جەمبەلي )

یا (جەنبەلي) ناڤێ میرەکـــي (هەکارا)یە • سەرپێهاتیـــــ ( جەمبەلي وبنەفشا ناریـــن ) دکورستانــــێدە ناڤ‌دارە • بلۆرین وستران دبێژن •

ع ـ (اسم قصة غراميـــــة كوردية) •

( جەرسي )

ئەو مرۆڤێ کۆ گونهـــێ وي ئەشکەرا دبي • هەروەکـــو زێرە لجەرس ـ زەنگـــل بدن • وادیارە کۆ دکەڤارەدە مرۆڤێ بەدکار دجەرساندن • جەرس دخستن قرکـ وي ودگـــەراندن • ژلـــەورا کورمانجا ئەڤ ناڤ گۆتنە •

ع ـ (المفضوح) •

## ( جه ـ ئۆ )

( جەمۆ )

ناڤێ بەستاکە کورمانجي‌یە •

دبي ژ جەميـــــلا ـ (جميلة) هاتبي • ژبەركـــۆ دبەستێدە دبێژن :ـ لێ جەمۆ جميلا •
ع ـ (منولوج كوردى) •

**( جەوز العرب )**
نافێ گەياكێـــــە • بنێ وى وەكە گوزە • ژچولێ دچـــن وزارۆك دخون •

**( جەناب )**
سۆرا زهەڤرە دبێـــــژن :ـ جەناب ! يانى برومــــەت • ژعربي هاتيە • لێ دزمانـــێ عربي دە ژي جهـــــێ وێ وندايە • ترك وكورد وعرب ولۆ دبێژن :ـ ع ـ (جناب) •

**( جەلەب )**
ژعربي هاتيە • لێ بەستاكـــە كوردى لسەر هەيــــــە • كورمانج ديلانێ لبەر دكن:ـ هەيى جەلەبە ، هەى جەلەبە• ژموسل آني حەلەبە • دبــەر پالەيێ رە تێ گۆتن •
ع ـ (القطيعان من الاغنام ) •

**( جەس )**
تۆزەكە سپيـيە • خانــــــــى وآڤانيـيێ كەڤرى پێ آڤادكن• عرب ژي دبێـــژن :ـ (جص) لێ نزانم ژكـــــو هاتيـــــــە • باوەرناكم ژعربي هاتبي •
ع ـ (الجص) •

**( جەندەرس )**
گوندەكە • لراژۆرێ باژارێ (حلب) لچيانێ كورمانجـــــا دكڤي • لێ نزانم ژكو هاتيە•
ع ـ (قرية) •

**( جەخ )**
زيندارى يەكە بخوەشـــــي ومەردانەيە • دبێژن :ـ بارام جەخ دكي • يانى خــــوارن وڤەخوارن ووەرگرتنا خـــــوە خوەش دەربـــاس دكى ، راد بوێرى • لێ نزانم (جەخيخ) ژكو هاتيە •

**( جەلغ )**
ياجەلغ • قەلشێ كـــــــــۆ دقادێ ڤەدبن • دبێـــژن :ـ جەلغەك دخانيـيێ مە ڤــــە بويە • يانى قەلشەك ڤەبويە•
ع ـ (شق) •

( جەود )
يا (جەودك) كونێ آفێيه • جەودك بچوكێ جـــەودە • ژ (گەودە) هاتيه • گـــەود يا (گەودە) قلافەتە ـ قيافەتە • لاشەكي بێ كێرە ـ بێ كارە ـ بێ فێدەيە •

ع ـ ( القربة ) •

( جەماد )
نافێ دو مەهێ عربێـنـــه :ـ جەمادا پێشي ، جەمادا پاشي •
ع ـ (جماد الاول جمادالثانى)

( جەمشيد )
نافێ پادشاهەكي ايرانيـيـــه • پاشێ بويه نافەكي تەڤايـــى • كورد وترك وفارس فـــــي نافي لزاروكێ خوە دكن •
ع ـ (اسم ملك ايرانى قديم)

( جەباخچور )
بازارەكى كوردســـــــتانـا بن دەستێ تركايه • زازن •
ع ـ (مدينة كوردية) •

( جەر )
كوزێ آفێيه • كوپێ آفێيه •

(جر ـ جرة) دبي ژعربـــــي هاتبي • لێ دبي ژ گەر ـ بـ گير هاتبي • (گير ـ گيري) نەوڤا جەرە • يا چەجهێ ورە وكويە • ع ـ (جرة) •

( جەرجەر )
گەرگەرە • كورمانج پێ سايێ خوە لسەر بێدرێ هـــوز دكن • ياني گلك دگـــەري لێ (گ) گلـــك جـــارا دكوردىدە ب(ج) تـــــێ گوهەراندن • وەك :ـ گزير ـ جزير ـ گۆرە ـ جۆرە • زەنگير ـ زەنجير • گومرك ـ جمرك •
ع ـ (الجرجرة) •

( جەرجور )
نافێ وى قالكێ كۆ فيشەكـــا دخنێ • جەرجورێ تفنگێ ، جەرجورێ ئۆتماتيكێ • ••• لێ نزانم ژكوهاتيـــه • دبێ ژ (شانژور) افرانسي هاتبي •
ع ـ (　　　)

( جەزیر )

گزیره • سینۆره‌كه • دكه‌ڤي ناڤبه‌را دو آڤیا نایێ آژۆتن • پاشێ بویه ناڤێ گراڤ وناڤ‌رۆكا • جزیرا بۆتا گراڤه‌كه دناڤ چه‌مێ دجله ده‌یه • پای‌ته‌ختا ده‌ره‌به‌گي‌یا بۆتایه ـ به‌ختایه • ناڤ‌داره • عرب دبێژن :ـ

ع ـ (جزیرة ابن عمر) •

( جه‌عفه‌ر )

ناڤه‌كی ته‌ڤاییێیه • بڤي ناڤي جه‌عفه‌رێ به‌رمه‌كي ناڤ‌داره• دبێژن به‌رمه‌كی فارسن • وهاره‌نگه جه‌عفه‌رپاشا عه‌سكه‌ری بڤي ناڤي ده‌نگ دایه • كورده ژگوندێ ( عه‌سكه‌ری ) یه • وه‌زیرێ به‌رخوه‌دانا عراقێ بو ده‌سه‌رێهاتي‌یا به‌كرصدقي ده هاته‌كوشتن •

( جه‌عبه‌ر )

كه‌له‌هه‌كه ل‌جزیرێ ول‌ڨراغا چه‌مێ فه‌راته • گۆرا (سلیمان شاه) باڤێ عثمانیا تێ‌ده‌یه •

( جه‌قه‌ر )

ناڤێ سه‌رله‌شكه‌رێ پادشاهێ موسل ( محمود ره‌نگی یه • كۆ عبدالله كورێ عیسا كورێ ابراهیم دسالا ٥٢٨ ـ ١١٠٨ ده كوشت وكه‌له‌ها ( ره‌یبه ) و (ڨه‌ي) و (فه‌ره‌ح) وهن كه‌له‌هێن دی ژي خستن بن‌ده‌ستێ حكومه‌تا موصل •

( جه‌گه‌ر )

كه‌زه‌به ـ جه‌رگه • دبي ( جرگ وجگر ) سه‌روبنێ هه‌ڤ بوبن • لێ جه‌رك ب‌داخوازا كه‌زه‌به • به‌لام (جه‌گه‌ر) جارنا بداخوازا دل‌ژی تێ ( جگرخون ) دل‌بریندار‌ه• جان وجه‌رگه‌ر ـ جان ودله • لێ برێ جارا بداخوازا جه‌رك ـ كه‌زب هاتیه •

ع ( الكبد او القلب ) •

( جەمهور )

ژ دو ناڤا گهایه هەف :ـ
ـ جەم ـ هور • (جەم)
بداخوازا جڤاتە • (هور)
بداخوازا بچوك هاتیه • وا
دیاره دچاخێ ساسانیێا ده دو
جڤات هەبون :ـ جڤاتا (سەرا)
وجڤاتا (هور) • کەسری
ـ کەیسرا ـمەزن وسەرەکێ
جڤاتا ( سەرا ) بو :ـ ( عظیم
العظماء ) و ( بزرجەم هور )
مەزنێ جڤاتا هور بو • جڤاتا
(سەرا) مجلس الشیوخ ـ
الاعیان • جڤاتا هور ـ (مجلس
النیابي) بو • پاشێ کەتیە •
زمانێ عربي بویه (جەمهوریة)

( جەنزیر )

سەرگوهەرێ زەنجیره ـ
زەنگ‌گیره • ئەو هاسنێ گو
زەنگ دگري • ئەو خەلەکێ
کو بهەڤە گرێدایی بونە
زەنگ • پاشێ بویه (زەنجیر)
بویه جەنزیر دبێژن :ـ
بهەڤە (بزنگرێ) خورت ـ
بەقوەت گرێدە •
ع ـ (سلسلة حدیدیة) •

( جەنانێر )

(آلوجە) یه • دبێژن :ـ
جانێرك بچوكێ جەنانێره •
بەرەکە ژهنجاسێ بچوك‌تره
دەما نو دگهێ شینه ، لێ کو
هنك دمێني سۆر دبي •
ع ـ (اجاص) •

( جەهیر )

کورێ جەهیر • ئێ کو
وزارەتا حکومەتا دیاربەکر ـ
حکومەتا مەروانیێا کریه
وپاشێ داویا وێ حکومەتا
کوردی مەروانی کو بێتر
ژسەد سالي مایه ، آنیه •
وشونا وان گرتیه • چیرۆك
وسەرپێهاتیا ( کورێ جەهیر )
ومەروانیێێ کورد دتاریخاده
ناڤدار وبدەنگە •
ع ـ ( ابن جهیر ) •

( جەوهەر )

گەوهەره • کەڤرێ گران‌بها
وبرومەتن •
ع ـ (الاحجار الکریمة) •

( جەوەر )
ناڤێ برایێ (سمكوآغا) ئـــێ شكاكی كۆ بدەستێ عەجەمـا هاتیە كوشتن•سترانەك لسەر هاتیە چێكرن •
ع ـ (اسم رجل معروف) •

( جەوهەر )
یاجەوەر • دشور وخەنجـرا دە رەنگەكە یا سەماغەكـــە •
دبێژن :ـ بارام هاڤەینـــێ جەوهەر تێدە پەیدا نابـي •
وەكـــە خەنجرەكـــە بـــێ جەوهەرە • یانـــی داماریێ مێرانی ومەردي تێدە پەیـــدا نابن • ع ـ (الصیقل) •

( جەور )
چێلیێ جناوەرێ گۆشتخوەرە :ـ دبێـــژن :ـ جـــەورێ كوچكا ، جەوركێ گـــورا ، جەوركێ شێرا •
ع ـ (جرو ـ شبل) •

( جەگەرمژ )
ناڤێ سەردارەكی حكومتـــا (موصل) بو • خوینخـــوار وتالانكەر ومێركـــوژ بو •
گلك ژكوردا كوشـــتنە •
جەگەرمژ ـ ئێ كۆ جەگـەرا مرۆڤا دمژي ـ دخـــوی •
جەگەر ـ كەزەبە • جارنـــا بداخوازا (دل) تێ :ـ جـــان وجەگەر من بونە خوین •••
جانودلە • •

( جەیش )
دبي ژ (كێشـــن) هاتبـــي •
ژگش ـ گشتك ـ گشـــك هاتبي • دبێژن:ـ گش وەرن•
یانی هەمو وەرن ـ تـــــەف وەرن ـ پێكڤە وەرن ـ پێكەوە وەرن • پاشێ بویـــە گێش ـ جێش جەیش • لەشكەر •
ع ـ (العساكر) •

( جەقجەق )
ناڤێ چەمەكی یە • ژسـەرێ آڤارەشـــێ ژۆرێ بـــاژاریێ ( نصێبین ) دەردكەڤي • دناڤ باژاریێ ( نصێبین ) و (قامشلۆ) رە دەربـاس دبي • لباژاریێ (حسكە) تێكەلي چەمێ ( خابـــور )

دبي • ع ـ (نهر جقجق) •

( جه‌وق )

يا (جۆق) نافێ وي تيستێ موسيقاره كۆ بهه‌ڤره سازبه‌ندی دكن •
ع ـ (جوق الموسيقا) •

( جه‌نگ )

ناڤداره • كورمانج دبێژن : (شه‌ر) • لێ د ديوانێ كورمانجي ده جه‌نگ تێ گۆتن • :ـ زێربازنا جه‌نگ وشه‌ره • ع ـ (الحرب) •

( جه‌رگ )

جگه‌ره ـ كه‌زه‌به ـ مێلاكه • دبي سه‌رگوهه‌رێ ( جگر ) بي • لێ ئه‌م هه‌ردوا ژي دبێژن • :ـ جه‌رگ ودل • جان وجگر •
ع ـ (الكبد) •

( جه‌نه‌رال )

يا گه‌نه‌رال • روتباكه ـ ده‌لامه‌ته‌كه له‌شكرى‌يه دبن مارشال ره‌يه • (لوايه) • ( مارشال ) ميرلوايه •
ئه‌وروپي‌يه • لێ به‌لاڤبويه •
ع ـ ( لواء ) •

( جه‌م )

بداخوازا نك ـ كن ـ لاي ـ بال ـ ره‌خ • هاتيه • بارام ل جه‌م فه‌رهاده • ل نك فه‌رهاده ل‌كن فه‌رهاده •
ع ـ ( عند ) •

( جه‌گه‌رخون )

يا جگرخوين • نافێ منه• ناڤوده‌نگێ منه • دڤرده داخواز ژ(جه‌گه‌ر) دله • نه‌جه‌رگه • دل‌ب‌خوين ـ دل‌برينداره • لێ ژده‌ستێ كێ بومه جه‌گه‌رخوين ؟ ل‌ديوانا من ره‌قه‌م (١) يه‌ك ته‌ماشا بكن • ته‌نێ ده‌م دكاري بدى‌زانين • ژديوانا سه‌يدايێ‌خانى ئه‌ڤ ناڤ من ستانديه • (مه‌مێ جگرخون)•
عـ(جريح‌القلب) لقب صاحب الكتاب •

( جه‌ه )

يان (جۆ) • ل‌پاش گه‌نم

تێ • گه‌نم وجۆ ـ گه‌نـــم
وجه‌هـ • ژ گـــه‌نم (آرزان)
تره • نه‌ژ به‌لـــه‌نگازی • بي
مرۆڤ نكاری ب‌خوی • لـــێ
كوردێ ره‌به‌ن گلك دخـون
ـ دخوارن •

( جه‌وجه‌و )
یا جه‌وجه‌وك • كوچكـــێ
پیسكن ـ هورکن •ژكوچكێ
عره‌باره ئـــه‌م دبێـــژن :ـ
جه‌وجه‌وك •
ع ـ (الكلاب الصغیرة) •

( جه‌دمو )
نه‌خوه‌شي‌یه‌كه دكه‌ڤي پشـتا
هه‌سپ وقانتر وكه‌را • جارنـا
دكه‌ڤي ستوێ كـــه‌را ژی •
كول بونه‌كه دور ودرێژه •
زو ساغ نابي • دبیـــژن :ـ
پشتا كه‌رێ مه جه‌ده‌وي بویه•
كول بویه •
ع ـ (نـــوع مـــن امراض
الحیوانات) •

( جه‌له‌و )
هه‌ڤســارێ هه‌ســـا یـــه :ـ
جه‌له‌وێ خۆش فه‌گرین هاتیه
نه‌ویا عه‌جـــــه‌مێ • لغاب ـ
جه‌له‌و • ع ـ (لجام) •

## ( جۆ ـ ئۆ )

( جۆ )
جۆبار • جهۆكێ كـــۆ آف
دواره دهه‌ركي • جـــۆبار ـ
جوێ بهارا نه • وه‌ك:ـ رۆ
و رۆبار • (بار) ژبهار • یـــا
(باران) هاتیه • یانی بهارا یـــا
ده‌ما كۆ باران دبـــاري آف
دواره دهه‌ركي •
ع ـ (الساقیة) •

( جۆ )
بداخوازا (جه‌هـ) •
ع ـ ( الشعیر ) •

( جۆتۆ )
یان ( گۆتۆ ) • ناڤه‌كـــــی
كه‌ڤاره‌یه • ژبۆ ( كـــورد )
هاتیه • ع ـ (المحارب) •

( جۆت )
بداخوازا ( زۆ ) هاتیـــــــه
جۆته‌ك ژن • جۆته‌ك مێر •

جۆته‌ك دار •
ع ـ (الزوج) •

**( جۆت )**

**بداخوازا جۆتكرنه ـ آزۆتـن**
وچـندني يه •
ع ـ (الفلاحة) •

**( جۆمه‌رد )**

ژجوانمه‌رد هاتيه • مـه‌ردێ
جوان •
ع ـ (الرجل السخي اوالطيب)

**( جۆده‌رز )**

ياگۆده‌رز ـ گوهده‌رز • ناڤێ
گه‌رناسه‌كي كورده ناڤداره•
دچيرۆك وسه‌رپێهاتي‌يێ مـه
ده گلك ئه‌ڤ ناڤ هاتيه •
ع ـ (اسم بطل كوردى قديم)

**( جۆبار )**

ده‌رباس بويه • جوێ بهارا ،
ياجوێ كۆ آڤا بارانــێ تێ‌ره
دچي •
ع ـ (ساقية الربيع) •

**( جۆكه‌ر )**

ناڤێ په‌له‌ك كاغزه كـــۆ
دليزێ ده دكه‌ڤي هه‌ر ده‌رێ•
ع ـ ( جۆكه‌ر ) •

**( جۆنديَر )**

ناڤێ شركه‌ته‌كه ئه‌وروبي‌يه •
ته‌ره‌كتۆر و پاله‌ڤانا ـ مه‌كينـا
چێدكي • ئه‌وروپي‌يه لـــێ
به‌لاڤ بويه •
ع ـ (شركة جونديَر) •

**( جۆر )**

گۆره • سۆراني‌يه •دبێژن:ـ
بەم جۆره ناخوازم بكـــم •
به‌جۆره‌ى قسه‌داني خـــه‌لك
وا ئه‌لێن • كورمانج دبێژن :ـ
ل‌گۆرا گۆتنێ خه‌لكێ ولـــۆ
دبێژن • ل‌گۆرا به‌ركا باڤـێ
خوه نگێ خوه راده •
ع ـ (اسلوب) •

**( جۆش )**

كه‌له • نه‌كوردي يه لـــێ
دديوانێ كوردي ده گلـــك
هاتيـه • جۆشـين ـ يـــا
هه‌ل‌جۆشين • كلاندنه •
ع ـ (غليان) •

( جۆك )

بچوكێ (جۆ) يه ٠ جهۆك
ژى تێ گۆتن ٠
ع ـ (ساقية صغيرة) ٠

( جۆلەمێرگ )

باژارەكي كوردە دبن‌دەستێ
تركادە يـــه ٠ پاى‌تەختـــا
دورەبەگێ‌يا وەلاتێ (هەكارا)
يه ٠ ع ـ (مدينة كوردية) ٠

( جۆل )

تەڤليهەڤە ٠ پەزێ جـــۆل ـ
پەزێ تەڤليهەڤە ٠ جوێلەك
ئێ كۆ نەهەمبانە ٠ پەزێ وان
تێكەلە ٠ سوالێ وان تێكەلن٠
بێشا وان كێيمە ٠
ع ـ (خليط) ٠

## ( جو ـ آ )

( جودا )

جيا ـ جهـــێ يـــه ٠ بارام
وفەرهاد ژهەڤ جودا بونە ـ
جيا بونە ـ جهێ بونە ٠ هـــن
دبێژن :ـ (جدوا) ٠

ع ـ (الافتراق) ٠

( جوانگا )

گايێ جوانــە ٠ گـــۆلك ـ
پارۆنە ـ جوانگا ـ گا ٠ هن
دبێژن :ـ جۆنەگا ٠
ع ـ (صغار الثور في عامـــه
الثالث) ٠

## ( جو ـ ئێ )

( جورێ )

ناڤێ ژنايە ٠ گولا جـوري ـ
سۆرە پەمبەيـــە ٠ ئـــەڤ ژ
گولاجوري هاتيە ٠

( جومێ )

هەريمكە ـ سەمتەكـــە ٠ ل
رۆژآڤـــايێ ژۆرێ باژارێ
(حلب) دكەڤي ٠ خەلكێ وێ
هەمي كوردن ٠
ع ـ (منطقة شمال غربي‌حلب)

( جونێ )

ناڤێ ژنەكێ‌يە ٠ ژ(جـــون)
هاتيە ٠ رەنگەكە دناڤبـــەرا
رەش‌وشين دە يه ٠

# ( جو ـ ئي )

**( جودي )**

چياكي ناڤداره دراسەرێ جزيرا بۆتا دەيه • دبێژن :ـ گەميا ( نوهـ ـ نوح ) لسەر ڤي چيايى راوەستايه •

(شاخ) هاڤينگەها ميرێ بۆتا دناڤ چيايێ جودى دە پرخوەش وناڤداره •جزيري دبێژى :ـ شاخه عمرى بخوه بەر ژێ • وژ (قەيسەر) مەكه بەحث •

ع ـ (جبل جودى) •



# فهرەست

# چەوت وراست

| روپەل | ستون | خێز | چەوت | راست |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | ١ | ٣ | آزبەنا | آزبەتا |
| ٢٨ | ٢ | ٢١ | میا | مێرا |
| ٢٩ | ١ | ٦ | هـ | هن |
| ٣٠ | ١ | ٢١ | غەینتاب | عەینتاب |
| ٣٠ | ٢ | ٣ | غینتاب | عەینتاب |
| ٣١ | ١ | ٤ | چۆیە | چێبویە |
| ٣١ | ١ | ١٤ | ئەرربا | ئەرر |
| ٣٢ | ١ | ١٠ | و | وا |
| ٨٥ | ١ | ١ | فوماش | قوماش |
| ٨٧ | ٢ | ٤ـ٩ـ١٣ | رەوشتم | رۆشتم |
| ٨٧ | ٢ | ١٨ | سوراني یە | سۆراني یە |
| ٨٨ | ١ | ٢١ | یەجنەویا | بەجنەویا |
| ٨٩ | ١ | ٢ | نە | تـە |
| ٨٩ | ٢ | ٢ | دومرۆقی | دو مرۆقێ |
| ٩٠ | ٢ | ٦ | تەفنێ پی | تەفنێ بێ |
| ٩١ | ٢ | ١٧ | اطرف المیاه | اطراف المیاه |
| ٩٢ | ١ | ٢٣ | الشجرة | شجرة |
| ١٠٦ | ٢ | ٤ | بەلەندیر مي لێ بزن | زێدەیە |
| ١٠٦ | ٢ | ١٨ | نافێوێ آلافێ | نافێ وێ آلافا |
| ١١٢ | ١ | ٢١ | فەلێ قتۆ | فەلیتێ قوتۆ |
| ١١٥ | ١ | ١ | القطقان | القطمان |
| ١١٩ | ١ | ٨ | بێژێ | بێزێ |

# چەوت وراست

| روپەل | ستون | خێز | چەوت | راست |
|---|---|---|---|---|
| ١٢٣ | ٢ | ١٨ | حەربي‌يێ | حەري يێ |
| ١٢٥ | ٢ | ١٣ | سالم | مسالم |
| ١٢٨ | ٢ | ١٥ | پرسيك | پريسك |
| ١٢٩ | ٢ | ١٨ | المختطر | المخطر |
| ١٣٠ | ٢ | ١٣ | پژك | پزك ؟ |
| ١٣١ | ١ | ١٥ | ـ بێ | زێدەيە ؟ |
| ١٣٢ | ٢ | ٢١ | پێڤان | بێڤان |
| ١٤٤ | ٢ | ٢ | گەشتێ‌ي | گەشتي |
| ١٤٧ | ٢ | ٧ | دەرباس يويە | دەرباس بويە |
| ١٥٥ | ٢ | ٢٣ | دكارن سێژن | دكارن بێژن |
| ١٨٦ | ٢ | ١٨ | ( تاخۆ ) | ( تاڤۆ ) |
| ٢٠٤ | ١ | ٥ | ورنسا | فرانسا |
| ٢١٦ | ١ | ٣ | دەهم‌ـ سەمت ـدەر ـ شون | زێدەيە ؟ |
| ٢١٦ | ٢ | ٨ | دەنگێ شكەتێ يـە | دەنگێ شكەستنێ يە |
| ٢١٨ | ١ | ٤ | يا بەڤزين | يا تەڤزين |
| ٢١٨ | ١ | ١٨ | بارو رێ | بارو دێ |
| ٢٢٢ | ٢ | ١٤ | دگۆكا خوەدە | دكۆكا خوە دە |
| ٢٢٧ | ٢ | ١٥ | بلقار | بلفار |
| ٢٢٧ | ٢ | ١٩ | ناڤيرا | ناڤ بەرا |
| ٢٣٥ | ١ | ٤ | خورعابدين | طۆرعابدين |
| ٢٣٥ | ٢ | ١٨ | تۆق بەني‌يێ | تۆق و بەني‌يێ |

# چەوت وراست

| روپەل | ستون | خێز | چەوت | راســـت |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤٢ | ١ | ١٥ | عەلۆل | عەلۆك |
| ٢٥٠ | ٢ | ٢٢ | جیایێ | چیایێ |
| ٢٥٣ | ٢ | ١٥ | مامەلاں | مامەلان |
| ٢٥٥ | ١ | ٧ | کورین | کورێن |
| ٢٥٥ | ٢ | ٩ | روستەم | بە روستەم |
| ٢٥٧ | ١ | ١ | دەیەلەم | دەیلەم |
| ٢٥٨ | ٢ | ٨ | زا یە | سەزایە |
| ٢٦٥ | ١ | ٨ | هەدوەکو | هەر وەکو |
| ٢٦٦ | ٢ | ٢ | نارقي | نارەڤي |
| ٢٦٦ | ٢ | ١٣ | سەد مروف | سەد مرۆڤ |
| ٢٦٩ | ٢ | ٦ | سف درین | ضەفدرین |
| ٢٧٥ | ١ | ١١ | سەرکان | سەرکانا |
| ٢٧٨ | ١ | ١٢ | د ل | و ل |
| ٢٧٩ | ٢ | ٢٠ | سیسێ | سسێ |
| ٢٨٣ | ٢ | ٢١ | وەیمالا نە | وەی مالاتە |
| ٢٨٤ | ٢ | ١١ | وددەی | و د دەمێ |
| ٢٨٥ | ٢ | ١٣ | ( س ـ آ ) | ( سي ـ آ ) |
| ٢٨٦ | ١ | ١١ | ب کەڤي | دکەڤي |
| ٢٩١ | ٢ | ١٥ | سسێ | سسێ |
| ٢٩٢ | ٢ | ١٠ | وجاڤە | و باڤە |
| ٢٩٣ | ٢ | ١٩ | ناقێ | ناڤێ |
| ٢٩٧ | ٢ | ١٦ | آڤەزەني | آڤزەني |
| ٣٠٤ | ٢ | ٤ | تەینك | نەینك |